

# وەسیەت

خالید ئێرتوغروڵ

ناوی کتێب : وەسیەت

نووسەر : خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ : سروشت رەئووف

تیراژ : (٢٠٠٠) دانە

نۆبەی چاپ : یەکەم - پاییزی ٢٠١٢

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٩٣٤)ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێ دراوە




ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com



# ئەمە وەسیێتنامەی تاوانبارێکە

نازانم باسی چیتان بۆ بکەم؟ لەکوێوە دەست پێ بکەم! باسی ئەو نەفسە تاوانبارەم کە بووە هۆکاری چەندەها هەڵە!! یان باسی ئەو نەگبەتیانەی کە بوومە هۆکاریان! باسی ئەوەی کە ژیانی چەند زوڵم لێکراوم ڕەش کرد... یاخود باسی ئەوەی کە چۆن ژیانی خۆشەویستەکانمو خێزانەکەم پەرێشانکرد!!!

بەردەوام لە ئازاری ویژدانمدا دەتلێمەوە، بۆیە بڕیارمداوە ئەم وەسیێتنامەیەم بنووسرێتەوە، تا هەمووان بەگەنجو پیرەوە گوێبیستی

بن بۆئەوەی مرۆڤەکان لەداوی کۆمەڵگە ئاگادار بکەمەوە، بەچاوی پڕ ئەسرینەوە داوا دەکەم بنووسرێتەوە...

دەڵێم "بنووسرێتەوە" چونکە خۆم توانای نووسینم نەماوە.

من کردەوەکانو هەڵەکانم لەشێوەی وەسێتنامەدا "بەتایبەت بۆ ئەوەی گەنجەکان بیزانن" دەنووسمەوە، لەکاتی باسکردنی ئەم ڕووداوانەدا دڵم پڕە لەئازاری ویژدان.

دەبێت ئەمە بەهەرکەسێك کە دێتە سەر ڕێم ڕابگەیەنم کە ئەو ڕووداوانە چەندە ترسناكو ناخۆشو پڕ تاوان بوون...

بەڵام چیتر ماوەم بەدەستەوە نەماوە، من کەسێکم گەیشتوومەتە کۆتایی ڕێگا...

کە بیر لە حسابی ئەو گۆڕە دەکەمەوە کە دوای دوو هەنگاوی تر پێی دەگەم ناخم وەك پشکۆ دەسووتێت.

لەبەر ئەم هۆیە پێش ئەوەی ماڵئاوایی لەم دونیا فانیە بکەم، هەڵپە بۆ ئەوە دەکەم کە ڕاستیەکان بەوانەی دوای خۆم بگات، وەسێتنامەکەم بۆ ئەوانە...

تکاتان لێ دەکەم یارمەتیم بدەن، بەڵکو ئێوە بتوانن ئەو گوناهانەی کە کردومنو شیاوی لێخۆشبوون نین بەکەسانی تر ڕابگەیەنن، بۆئەوەی دەرك بەو هەلانە بکەن... ئەگەر چی کەمیش بێت ویژدانم ئاسوودە دەبێت...

من گەنجێکی یاخی بووم، گوێم لەقسە نەدەگرت، چی بەمێشکمدا بهاتایە دەمکرد، قۆناغی ئامادەییم زۆر بەدڵتەڕی بەسەربرد.

وەك کوڕی تاقانەی باوکێکی دەوڵەمەند بەو ئیمکانیاتانەی کە لەبەردەستمدابوون چی بەعەقڵمدا بهاتایە بەخۆبەزلزانی‌و بێ پەروایییەوە دەمکردو وەك گەنجێکی لەخۆبایی‌و بێ مەسئولیەت گەورەبووم.

لەوساڵانەی کە هەمووان لەهەوڵی کۆشش کردن‌و دەرچووندا بوون، من خەریکی پیلان دانان بووم بۆ ئەو کچە سادەو پاکانەی دەوروبەرم و، بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن بیانخەمە ناو داوی خۆمەوە.

ماستاوچییەکانی دەوروبەریشم کە بەپارەی ڕۆژانەی من دەژیان هاوکارییان دەکردم، وەك پۆلیسی پشکنەر دەکەوتنە دوای ئەو کچانەو سەرکەوتووبوون لەهێنانیان بۆ ئەو شوێنانەی کە من دەمویست...

باوەڕ بکەن لەکاتێکدا کە ئەم بەسەرهاتانە دەگێڕمەوە، دڵم تەنگ دەبێت‌و دەڵێی خوێن وروژم بۆ مێشکم دەبات، چونکە ئەو کارانەی کە دەمکرد ئەوەندە زاڵمانەو، نەفرەتی بوون کە خۆزگەم دەخواست کە ببوومایە بە هەزار پارچەوە ببوومایە بە خۆراکی جانەوەرەکان ئەوە بۆ من باشتر بوو.

دەستم چووە خوێنی چەندەها کچی هەژار، خەیاڵی چەندەها بێ تاوانم شێواند، ژیانی چەندەها کچی سادەو پاکم ڕەش کرد!

هێشتا لە پۆلی دووەمی ئامادەیی بووم، لەڤێلاکەی باوکمدا چەندەها گوناهی ترسناکم ئەنجام دەدا... خیانەتی وەهام دەکرد کە ئێستا وەك پشکۆ ناخی خۆم دەسوتێنن، بەشێوەیەك ئەو ڤێلایە شایەتی دەیەها نموونەی فەریادو پاڕانەوەی بێ چارەیی ئەوان بووە...

باوەژنەکەم منی وەلانابوو، باوکیشم بەهۆی کارەکەیەوە بەردەوام لە سەفەردابوو، بۆیە ئاگاداری کارەکانم نەبوو، نەك ئەوەش بگرە دەستو پێوەندەکانی ڕاسپاردبوو کە نەیاندەهێشت بکەومە بەندیخانەوە ئەمەش زیاتر ئازایەتیو بێ پەروایی پێ بەخشی بووم.

باوەژنەکەم چاوەڕوانیەکی شاراوەی هەبوو، ئەگەر بهاتایەو من کە تاقانەی ماڵ بووم لەنێو ئەو نازو نیعمەتە بێ سنوورەدا بەیەکجاریو بەشێوەیەکی خێرا ون ببوومایە، میراتی باوکە ڕیش سپیەکەم بۆ ئەو دەمایەوە، من دەمزانی، ئەو بەنهێنی خوازیاری مردنی من بوو.

باوکم لەبەرامبەر ئەو خێزانە زوڵم لێکراوانەی کە لەدواییدا بەدبەخت بووبوون لەهەر جارێکدا بەپارە بەرەنگاریان دەبوویەوە و منی لەژێر دەستی یاسا دەردەهێنایەوە.

لەڕاستیدا بەدەر لە هەموو ئەو نەگبەتییانە، من کێشەیەکی ترم هەبوو، کێشەی من نەبوونی باوکێك بوو کەلەهەر ساتێکدا پێم بڵێت: "بوەستە"! بەدوامدا بێتو دڵسۆزانە سەرزەنشتم بکات و لێم بپرسێتەوە.

هەروەها نەبونی دایکێکی میهرەبان بوو کەلەبەر من خەوی لێ بزرێت، هەموو ئەمانە کاری شەیتانیان ئاسان کردبوو کە منی بەرەو رێی خراپ هان دەدا...

هەروەها رێی ئاسان کردبوو بۆم ببمە مرۆڤێك کە چیم بوێتو چۆن بمەوێت ئەنجامی بدەم.

کاتێك گەیشتمە قۆناغی کۆتایی ئامادەیی، برای کچێکی دەستگیراندار کەمن ژیانم ڕەش کردبوو کەوتبووە شوێنم، تەنانەت چەند جارێکیش تەنگی پێ هەڵچنی بووم، بەڵام لە سایەی ئەو ماستاوچییانەی کەنەمدەهێشت لێم دوور بکەونەوە بۆ ماوەیەك لەو بەڵایە ڕزگارم ببوو، بەڵام ئەو گەنجە بەرچاوی ڕەش بووبوو وازیشی لەمن نەدەهێنا.پێش ئەوەی ئەو من بسڕێتەوەو لەناوم ببات پێویست بوو من ئەو بسڕمەوەو لەناوی بەرم..

## پیلانێکم بۆ پیاوەکانم داڕشت...

دووان لەوپیاوانەی کە هەموو ڕۆژێك گیرفانم پڕ دەکردن لەپارە ناردمن بۆی، تاوانەیەکی باشی فێر بکەن.

ئەو گەنجە ماستاوچییە دڕندانە، بەنیوە شەو چووبوون دابوویان بەسەر ماڵی کوڕەکەدا، لەبەرچاوی دایك و باوکیدا شوێنی ساغیان بەلەشیەوە نەهێشتبوو، هەرکەسێکیش لەماڵەکەدا ویستبووی بەرگری بکات خستبویانە ژێر پێیانەوە لەکاتێکیشدا کەویستبوویان لەماڵەکە بێنە دەرەوە، دایکی کە ژێر پێیان کەوتبوو دەم و چاوی پڕ خوێن بوو بوو دوعای لێ کردبوون و وتبووی:

– توانامان نییە لەبەرامبەر ئێوەدا! بەڵام ئێوە حەواڵەی لای خوا دەکەین یان ئیصلاحتان بکات یان لەناوتان بەرێت.

بێ گومان لەوکاتەدا کەسێکی وەك من کە پێم وابوو دەتوانم هەموو شتێك بەپارە بکڕم، دوعاکردنی ئەو ستەملێکراوانە بەلامەوە گرنگ نەبوو.

بەڵام ئەو کردەوانەش هەڵەیەکی گەورەبوون، بەڵێ بەلای منەوە ئەو خێزانە پێویستیان بەوانەیەك بوو، بەڵام چوونە سەر ماڵ هەڵەیەکی گەورەبوو، نەدەبوو ئەو کارە شێتانەیە لەوێ بکرایە.

جارێ هەر نەدەبوو دەست لە دایك و باوکی بەرز بکرایەتەوە ئەوەش نەك لەبەرئەوەی عەیب یاخود گوناهە، بەڵکو لەوە دەترسام ئەوەی ئەوان کردبوویان تاوان بوو، ئەگەر نا من لەو ساڵانەدا هیچ هەستیارییەکم بۆ "عەیبەو، گوناه و، بەهەشت و، دۆزەخ و، بەها مەعنەوییەکان" نەبوو.

بۆئەوەی لەبەر ئەو هەڵەیەی کە کردبووم نەکەومە مەحکەمەوە، یەکێك لەپیاوە بەڕێزەکانی باوکمم لەنیوە شەودا بەئاگاهێنایەوە و بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەم ناردم بۆ ئەو ماڵە. کاتێك پیاوەکە شەو چووبووە ئەو ماڵەی کە ناردبووم بۆی، خێزانەکەی لەحاڵێکی پەرێشاندا بینی بوو، کوڕەکە لەچەند شوێنێکیدا شکاوی هەبوو، دەمو لوتیشی پڕکرابوون لەخوێن، دایكو باوکیشی لەو پەرێشان تربوون، کچەکەشیان کە ئێمە خیانەتمان لێ کردبوو وەك ئەوەی عەقڵی لەدەستدابێت لەگۆشەیەکدا فەریادی دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ترسیان لەبەربەرەکانی ئێمە هەبوو نەشچووبوون بۆ لای پۆلیس... پیاوەکەی باوکم هەرلەوێدا مەسەلەکەی خستبووە ژێر کۆنترۆڵەوەو دکتۆری بانگ کردبوو، شکاوی کوڕەکەو برینی دایكو باوکەکەی تەداوی کردبوو، دواتریش هەزار جار دوای لێبووردنی لێ کردبوونو بەشێك پارەی لە گیرفانی دەرهێنابوو ویستبووی بیدات بە باوکەکەی لەبەرامبەردا باوکەکە هاواری کردبوو بەسەریدا:

—ئێوە دەتانەوێت شەرەفی ئەم خێزانە بەپارە بکڕن!! ئێمە زۆر هەژارین، بێ کەسین، غەریبین، بەڵام هیچ کەس ناتوانێت شەرەفو کەرامەتمان بەپارە بکڕێت.

مەترسن! شکاتیشتان لێ ناکەم، چونکە لەهەموو شوێنێك پیاوتان هەیە، کەس گوێ لەئێمە ناگرێت، هەم دووبارە دێنەوەو دەبنەوە

بەبەڵا بەسەر مانەوە، بەڵام ئێمە شکاتی خۆمان دەمێکە کردووە لای پەروەردگارمان، ئەوبەو ئەندازەیە دادوەرە کە مافی زوڵم لێکراو ناخاتە ژێر پێیانەوە...

درەنگ یان زووش مافی ئێمەتان لێ وەردەگرێتەوە.

## ئێوە لەئێمە نا، بەڵکو لەو بترسن!

پارەکەیان دابوویەوە بەڕوویداو دەرگاشیان بەسەردا داخستبووەوە ئەوە منی زۆر خۆشحاڵ کرد، بەخۆمم وت ئۆخەی! هەرچۆنێك بێ شکایەت ناکەن، دووبارە ڕزگارم بوو، لەبەر ئەو شکایەتەشی کە لای خودا کردبوویان هیچ بەخەیاڵمدا نەدەهات تەنانەت نەشدەترسام.

من لەناو ئەو ئیمکانیاتانەی کەباوکم پێی بەخشی بووم، چێژم لەخۆشییەکی ژەهراوی دەبینی.

هەرسێ چوار مانگێك سەیارەکەم دەگۆڕیو لەپێناو کەیفو خۆشی خۆمدا لەگەڵ چەند ماستاوچییەکدا بەردەوام بووین لەدەست خستنە گیانی خەڵکی و تێکدانی ژیانیان. یەکێك لەمامۆستاکانم کە لەنزیکەوە چاودێری حاڵمانی دەکرد ڕۆژێك منی بانگ کرد بۆژوورەکەیو بە ڕوویەکی گرژەوە دەستی کرد بە قسەکردن: سەیرکە موڕات، من تەمەنم گەیشتۆتە پەنجاویەك ساڵ، ئەوەت لەبیر نەچێت کوڕم!

هەرکەسێك ئازاری کەسانی تربدات خۆیشی ئازاری پێ دەگات، هەرکەسێك ماڵی کەسێك وێران بکات خۆیشی ماڵ وێران دەبێت ئاهوو فەریادی زوڵملێکراو ئەوەندە کاریگەرە، لەتوانایدایە ئەوە بکات کە هیچ جەلادێکیش پێی ناکرێت، ئەگەر بەزەییت بەو بێ گوناهانەدا نایەتەوە، بەزەییت بەخۆتدا بێتەوە، وازلەم کارە نەشیاوو ناشیرینانە بهێنە.

هەرکەسێك یاری بەناموسی خەڵك کردبێت بەدڵنیاییەوە یاری بەناموسی کراوەتەوە، من ئەمەم لەدرێژایی تەمەنمدا بینیوە، شایەتی زۆر کەس بووم کە باجی قورسیان داوە، چونکە مافی خەڵکیان پێشێل کردووە ئەمە جگەلەوەی هەرکەسێك کچێکی پاك هەڵبخەڵەتێنێت خودا سزایەکی وای بۆ بڕیوەتەوە کە ببێتە پەند بۆ مرۆڤایەتی.

کاری من ئاگادارکردنەوەی تۆیە، من پێم وایە، وەك چۆن ئەو کچە هەژارانە، بەرەو خۆکوشتن دەبەیت و دونیایان لێ دەکەیت بە دۆزەخ، ڕۆژێك دێت تۆش باجی زۆر قورس دەدەیت.

دەمەوێت پێت بڵێم ڕۆژێك ئاهی ئەو کەسانە تۆ لە ئازارێکی زۆردا دەخنکێنێ.

سەیرکە کوڕم! هێزو پارە هەموو شتێك نییە، ئەوانەی ئاهی زوڵم لێکراویان لەسەر بووبێت، تا کۆتایی تەمەنیان ئازاریان چەشتووە.

وازبێنە! لەم کارە ناپەسەندو قێزەونانەپەشیمان بەرەوە.

پێش ئەوەی قسەکانی تەواو بکات چوومە دەرەوە، من پێویستم بەو جۆرە ئاوازانە نەبوو.

ئەو ڕۆژە دووبارە وەك کاری هەمیشەییمان، پیلانێکی تایبەتمان بۆخۆمان دارشت بەنیازبووین ئێوارە کەمێك ڕابوێرین چەند ژوورێکی ئوتێلێکمان گرت، بەنیازی ڕابواردن لەگەڵ چەند کچێکی دەرەوەی شار کە هەڵمان خەڵەتاندبوون.

ئەو کچە هەژارانە، تازە دەهاتنە شارە گەورەکان بۆ خوێندن، ئەوان کەسانێك بوون کە بەهیچ شێوەیەك بیریان لەخراپە نەدەکردەوە هەموانیان وەك خۆیان بەدڵ سافی دەهاتە پێش چاو، ئەوان ئەوەندە سادەبوون کە لەخەیاڵی داهاتوویەکی دڵخۆشدا بوونو تەنانەت لەبیری ئەوەدابوون کە هاوسەرگیریمان لەگەڵدا بکەن.

ئەوان لەکوێ بیانزانیایە بەهۆی نەشارەزاییان لەیاری عەشقداو دوور لە کۆنترۆڵی دایكو باوکیانو لەناو ئەو جوانیە سیحراوییەی شارە گەورەکاندا چییان بەسەر دێت!.

ئەو فیلمە بەناوبانگە، دووبارە لەپەخشدابوو، دیمەنە ناسراوەکان دووبارە لێدەدرانەوە، دیسان هەمان دراماو هەمان ئازار دووبارە دەبوویەوە، ئەو شەوە سێ کچی پاك کە دەستیان بەردەستی هیچ

پیاوێك نەكەوتبوو هەموو ئاواتو چاوەڕوانیو عیشقو خۆشەویستیان لەژوورەكانی ئەو ئوتێلەدا چووە ژێرخاكەوە.

پێویست دەكات باسی دوای ئەوەتان بۆبكەم؟

دواتر بیستمان كە یەكێكیان نەیتوانیوە بەرگەی ئەوە بگرێت كە دایكو باوكی بەو بابەتە بزانن لەبەرئەوە خۆی كوشتووە، یەكێكی تریشیان كەوتبووە حاڵەتێكی خراپترەوەو باندێكی لەش فرۆشی یەخەیان پێ گرتبوو، سێیەمیشیان لەداخی ئەوكارە وەحشیانەی كەبەسەریدا هاتبوو ژیری لەدەست دابوو، دەبوو تەمەنی لەنەخۆشخانەی دەروونی بەسەرببات.

پیاوەكانی باوكم بەسەرف كردنی بڕێك پارەی زۆر توانییان لەم كارەش قوتارمان بكەن.

چیتر ڕق و قینە بەرامبەرمان زۆر زیادی كردبوو، چەندەها خێزان بەدوامەوە بوون و بۆ ئەوەی بمخەنە داوەوە ڕۆژیان دەژمارد.

پیاوەكانی باوكم كاتێك هەستیان بەمەكرد، چاودێری تایبەتیان ڕێكخستبوو (٢٤) كاتژمێر پاسەوانییان دەكردم.

بەڵام باری ئەو ژیانە دوور لەمرۆڤایەتیەی من ئەوەندە قورس بووبوو كە حەزدەكەم واز لەباسكردنی بهێنم تەنانەت نامەوێت بێتەوە یادم.

ئەمە چۆن ڕوویدا؟

با ئەوەشتان بۆ باس بکەم.

بۆم دەرکەوت کە ژنە گەنجەکەی باوکم دووساڵ لەمەوبەر پەیوەندییەکی قێزەونی هەبووە، لەبەرئەوەش هەمیشە منی بۆ کاری نەشیاو هان دەدا، لەهەر فرسەتێکدا پێی دەوتم: "تۆگەنجی لەگەڵ ئەوەشدا جوانیت، لەبەر ئەوە چێژ لەژیان ببینە."

ئەو منی لەگەڵ گوناهەکانی خۆیدا تێوەگلاند.

ئەم بابەتە تەنانەت بۆمنێك کە ناموس‌و عیفەت‌و ڕێز هیچ بایەخێکیان نەبوو لەلام، کاریگەر بوو.

بەلامەوە ئاسایی بوو کچ و خاتوونی خەڵکی ئەو بێڕێزییەیان بەرامبەر بکرێت، بەڵام کاتێك دەهاتە سەر باسی خۆمان کارێکی قێزەون بوو، هەستێکی سەیر لەناخمدا پەیدا بووبوو.

بۆ یەکەمجار مەسەلەی ناموس و عیفەتم بەو جدییاتە وەرگرتبوو و لەناخی خۆمدا سزایەکم بۆ باوەژنەکەم بڕیبوویەوە. هەرچەندە تەنها من و باوکم بەو ڕووداوەمان زانیبوو.

باوکم کاتێك لە ئیش گەڕابوویەوە بۆماڵەوە، خێزانەکەی لەگەڵ گەنجێکدا گرتبوو کە تازە لە عەسکەری گەڕابوویەوە.. ئەو گەنجەش برای کچێك دەرچوو کە بەهۆی خیانەتی ئێمەوە ژیانی بۆ دۆزەخ گۆڕابوو.

تـازە بـەتازە خـەريك بـوو قسـەكانى مامۆسـتاكەم دەهاتنـەدى.. رەنگە لەبەرئـەوەش بووبێـت بۆ يەكـەمجار هەستم كـرد.. "كۆمەڵـە شتانێكى خراپ چاوەڕێمن"

كـابرا پيلانێكـى لـەم شـێوەيەى دارشـتبوو و بەخۆڕاگرييـەوە چاوەڕوانى ئەم ڕۆژەى كردبوو، تەنانەت لەوەشدا سەركەوتوو بوو كـە توانيبـووى تانـاو مـاڵى ئێمـەش بێـت، بەوەشـەوە نەوەسـتابوو باوەژنەكەشمى بەدەست هێنابوو.

بـەڵام شـتێك هـەبوو هێشـتا ناديـاربوو، ئـەويش ئـەوەبوو كـە ئايا باوەژنەكەى من نيەتى هێنابوو ئـەو گەنجە لـەڕێ لابـدات يـاخود ئـەو بەپيلان باوەژنەكەمى خستبووە داوەوە؟!

لەگەڵ باوكمدا پێكـەوە كارەكانمـان ڕێكخسـتو پياوكوژێكمـان بـۆ كوشتنى ئەو گەنجە پەيداكرد.

بـەڵام لەكاتێكـدا پياوكوژەكـە بەنيازبووگەنجەكـە بكوژێـت خـۆى كەوتبووە ژێر دەسـتى ئـەو گەنجـە چـاو كراوەيـەو بـە برينـدارىو بـە ئەستەم توانيبووى خۆى لەدەستى ڕزگاربكات.

ئـەو ڕووداوە ئێمـەى زيـاتر شـڵەژاند، ئەگـەر بهاتايـەو ئـەو هەواڵـە بگەيشـتايە بـەدەزگاكانى ڕاگەيانـدن هـەموو ناويـانگو پێگـەى بـاوكم لەدەست دەچوو، لەبەرئەوە پيلانى كوشتنى باوەژنەكەشمان لەلايەن ئەو پياوكوژەى كەبۆ ئەويشمان گرتبوو هەڵوەشاندەوە.

بەڵام باوەژنەکەم ئەوەندە فێڵبازبوو، هەستی کردبوو کەشتانێك خەریکن ڕوو دەدەن بۆیە لەماوەی یەك کاتژمێردا چووە ناو لیستی ونبووەکانەوە بەم شێوەیەش ژیانی خۆی ڕزگارکرد.

بەڵام هێشتا مەترسیەکان لەسەرمان لانەچووبوون، هێشتا پێویست بوو ئەو گەنجە بێ دەنگ بکرێت، چونکە ئەگەر قسەی بکردایە دەبووە کێشەیەکی گەورە بۆباوکم.

بابەتەکە ئەوەندە گرنگ بوو بەلامانەوە، کە خۆم لەگەڵ سێ لەپیاوەکانمدا بڕیاری کوشتنی ئەو گەنجەماندا، تەنانەت توانیمان لەپەنهانیەکدا بیگرین، بەڵام بێ ئاگا لەو بەڵاو نەهامەتییانەی کە چاوەڕێیان دەکردین.

ئەو گەنجە لەبەرامبەر چوارکەسدا پارێزگاری لە خۆی دەکردو ئێمەی تووشی سەرسوڕمان کردبوو، ئەو کەسێکی هەڵشەو بەرچاو ڕەش بوو، دەمێك بوو مردنی لەبەرچاو گرتبوو، بێگومان ئەو وەزعە بەئازارەی کە خۆشکەکەی تێی کەوتبوو بەتەواوی بیرو هۆشی لەبەر بڕیبوو، زۆر داخ لەدڵ بوو لێمان...

بەو چەقۆ گەورەیەی دەستیەوە بەرگری لەخۆی دەکرد، نەیدەهێشت تەنانەت هەنگاوێکیش لێی نزیك ببینەوە.

کاتێك زانیم ئەم ئیشە وا ناڕوات دەمانچەکەم دەرهێناو پەنجەم پیادانا ئەوەی سەیر بوو لەوێدا ئەوەبوو، هەرچیم بکردایە دەمانچەکە تەقەی نەدەکرد چونکە گیرابوو.

گەنجەکە ئەوەی بەفرسەت زانی و زیاتر ورووژاو وەك شێت چەقۆکەی بەرەو ڕوومان دەوەشاند، نەمانتوانی ڕابکەین، هەرچوارمانی دا بە زەویدا، وادیاربوو هەرسێ پاسەوانەکەم بە سەختی برینداربووبوون ئەوەبوو هەرلەوێدا گیانیان دەرچوو.

## منیش لەسەرسوڕمانێکی گەورەدابووم، حەپەسابووم!

ئەو گەنجەش بەهۆی ئەوەی لەلایەن یەکێك لە پاسەوانەکانمەوە بریندار کرابوو کۆتا ساتەکانی دەژیا، بەڵام ئەو لەمردن نەدەترسا، نیازی ئەو بریتی بوو لەتۆڵەسەندنەوە لەمن، کاتێك زانی کە خەریکە دەمرێت کۆتا هێزی خستەکارو چەقۆکەی دەستی لێ وەشاندم.

نەمتوانی پارێزگاری لەخۆم بکەم و چەقۆکەی لێدام، لەڕاستیدا ئەمە ئەو ڕووداوەبوو کەژیانمی ڕەش کرد.

لەوکاتەدا کەویستم ڕابکەم بەچەقۆکە ڕێك لەپشتەوە دای لەکەمەرم، هەستم بە ژانێکی وەها کرد وەك بڵێی گڕم تێ بەربووبێتو لەچەند چرکەیەکدا هەموو گیانمی سووتاندبێت، دواتریش لە هۆش خۆم چووم.

لەوکاتـەدا وەك پارچـە گۆشـتێك کەوتمـە سـەر زەوی، لەتەنیشـت گەنجەکەوە کەخەریك بوو بەهێواشی گیانی دەدا، بەبێ جوولە لەسەر زەوی کەوتم.

لـەخوار قاچـی ئـەو گەنجـەی کـە لـەکاتی پاراسـتنی ناموسـیدا بەسەربەرزییەوە گیانی لەدەستدا.

ژیانی دۆزەخیی من خەریك بوو دەستی پێ دەکرد، بێگومان ئـەوە ژیان نەبوو کەمنی تیابووم، هەرساتێکی مردنێك بـوو. مانـەوەم تـەنها بۆئەوە بوو ببمە پەندو، سزای هەڵەو تاوانەکانم وەربگرمەوە.

ئەو چەقۆیە تەمەنمی لەناوبرد و لەکەمەرمەوە بۆخوارەوە تووشی شەلەل بوو، تەنانەت زۆر بە زەحمەت دەمتوانی ملم بـەرێکی رابگـرم، ئایا پێویست دەکات باسی ئەوەتان بۆبکەم؟ کاتێك کەسێك کەبەحاڵ پێـی بەسـەر زەویـدا نـاوە مـەحکومی سـەرجێگە دەبێـت، چـەندە حاڵەتێکی ترسناکە بۆی!

بەڵام ئازارەکانم هەر بەمەشەوە نەوەستان، تومەس خـوای گـەورە ئەم سزایانەی بۆ منێکی ڕۆح تاریكو جانەوەر ئاسا بەگونجاو زانیبوو، ئەویش تەنها لەئێستادا.

ئەی دواتر؟

تەنانەت بیرکردنەوەش لێی دەی ترساندم.

لەبەرئـەوەی هەواڵـەکان گەیشـتنە دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن، بـاوکم نـەیتوانی لـەوە زیـاتر بەرگـە بگرێـتو لەئـەنجامی بەرزبوونـەوەی پەسـتانی خـوێن، تووشـی خـوێن بـەربوونی مێشـك هـاتو گیـانی لەدەستدا.

هەرچیماڵو سامان هەبوو بۆمنو باوەژنەکەم مایەوە.

ئیتر باوەژنەکەم لەبەر ئەوەی دەیتوانی بەئاسانی جڵەوی کارەکان بگرێتـە دەسـت بەبەشـەکەی خۆیشـیەوە نەوەسـتا، بـەڵکو دەسـتی بەسـەر بەشـەکەی منیشـدا گـرت، بـەبیانووی ئـەوەی مـن بـەهۆی نەخۆشیەکەمەوە ناتوانم خۆم بەڕێوەبەرم.

بەوەشـەوە نەوەسـتا، وەك بلێـی دەیویسـت تۆڵـە لـەمنو بـاوکم بکاتەوە هەر ڕۆژەی ناوی لەگەڵ ناوی پیاوێکدا دەهێنرا.

بەڵام لەڕاستیدا ئەوەی کەمنی دڵتـەنگ کردبـوو ئەمەنـەبوو، بـەڵکو ئەوەبوو کاتێك باوکم مرد هاواری کرد:

– بکوژی من مورات بوو.

ڕەنگە ئەوە تۆڵەی ئیلاهـی بووبێـت! ئیـدی مـن لـەنێو ئـاهی زوڵـم لێکراوەکاندا دەتلامەوە.

ئەی دواتر؟

ئێسـتا لەنەخۆشـخانەیەکی تایبەتـداو لـەو ژوورەی کـە بـۆم ئامـادەکراوە تـەداوی دەکـرێم، نـازانم ئەمـە تەداوییـە یـاخود سـزای

دۆزەخ! چونکە ئەوەندە ڕووداوی پڕ نهێنی بەدوای یەکدا ڕیزیان بەستووە کەهەموو ڕۆژێك هەزار جار ئاوات بەمەرگ دەخوازم لەناو ئازارێکی وەها دام کەئەگەر لەناو ئاگریشدا بسووتێم ئەوەندە هەست بەئازار ناکەم.

## چۆن؟ بابۆتان باس بکەم

ئەو نەخۆشخانەیەی کە چاودێریکردنی منی لەئەستۆ گرتبوو، لەبەرامبەر ئەو بڕە پارە زۆرەدا پزیشکێکی شارەزایان لەبواری نەخۆشیەکەمدا دابین کردبوو.

کاتێك چاوم پێکەوت خەتە ترسناکەکانی دەمو چاوی و سەرنجە لەرزۆکەکانی کەمرۆڤیان دەخنکاند منی بێ هۆش کرد.

لەتەمەنمدا یەکەمجاربوو ترسێکی وا پڕ نهێنیم لێ بنیشێت. حاڵەتی شەلەلەکەم زۆر زیادی کردبوو، تەنها دەمتوانی کۆنترۆڵی سەرمو بەشێکیش لەسەرووی کەمەرمەوە بکەم، لەهەموو کاروبارەکانمدا پەرستارەکان هاوکارییان دەکردم.

بەڕێوەبەری نەخۆشخانە هاتەلامو وتی:

– چیتر ناتوانین لەچارەسەرت بەردەوام بین.

پرسیم:

– لەبەرچی؟

وەڵامی دایەوە، وتی:

– پارەی داواکراو سەبارەت بەتۆ نەدراوە، ناتوانین بەم شێوەیە بەردەوام بین.

پرسیم:

– چۆن شتی وا دەبێت؟

وتی:

– ڕەنگە ئاگادارنەبن، چیتر ئێوە هیچ پارەو سامانێکتان نەماوە، هەمووی دایکتان وەری گرتووە، ئەویش لەبارەی چارەسەرتانەوە هاوکاریمان ناکات.

من چاوەڕێی ئەوەم دەکرد... ئەو ژنە شەیتانە میراتی باوکمی بە هیچ شێوەیەك لەگەڵمدا بەش نەدەکرد، ئێستاش لەگەڵ خۆشەویستەکانیدا ڕۆژەکانی بەخۆشی بەسەر دەبرد..

بەم حاڵەمەوە نەمدەتوانی تەداخولی بابەتەکە بکەم، تەنانەت ئەگەر بشم ویستایە یەك بەندەی خودا ئامادە نەبوو هاوکاریم بکات.

چاوەکانم داخست لەئازاری ئەوەی هەرساتێك ئەگەری ئەوە هەبوو فڕێ بدرێمە کۆڵان.

بۆ یەکەم جار هەستم بەبێ چارەیی دەکرد، کەواتە بێ چارەیی ئەمەبوو.. کەواتە ئەمە ئاهی ئەو کەسانەبوو کەڕۆشنایی ژیانیانم کوژاندبوویەوە.

سەرم داخستو بۆ ئەوەی بتوانم کۆنترۆڵی فرمێسکەکانم بکەم وتم:

—فرێم بدەنو ڕزگارم بکەن، دیارە "دادوەریی ئیلاهی" ئەمەی دەوێت.

لەوکاتەدا ئەو دکتۆرە میزاجییەی کە لە سەیرکردنەکانی دەترسام هاتە ژوورەوەو وتی:

—شتی وا نابێت!

زۆر سەرسامی کردم، بەردەوام بوو وتی:

—نەخۆشێکی وەها لەچ بارێکدا هەیە با ببێت، ناتوانین لە چارەسەری دابڕینو بینێرینە دەرەوە، ئەمە تاوانە.

بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە لێی ڕاست بوویەوە.

—چارەی ترمان نییە، ئێرە کۆمەڵگەیەکی خێرخوازی نییە، کەسێك بێتە ناو نەخۆشخانەیەکی وەها مۆدێرنەوە، پێویستە پارەکەشی بدات، ئەگەر ناشتوانێت پێویستە بڕوات.

ئەو دکتۆرەی کەبۆ چارەسەری من دانرابوو لەهەڵوێستێکی چاوەڕوان نەکراودا وتی:

—کاری من هێشتنەوەی نەخۆشەکانمە لەژیاندا، بەبەرچاوی خۆمەوە ناتوانم ئەوان بەرەو مردن بەڕێ بکەم، ئەگەر پێویست بکات خۆم

پارەکـەیان دەگرمـە ئەسـتۆ، بـەڵام ڕێگـە نـادەم لەچارەسـەر بیوەستێنن.

–کەواتـە ئێـوە لەچارەسـەی بـەردەوام بـن، ئێمـەش لـە بڕەپـارەی مانگانەتان بەشی تێچوونی ئەم نەخۆشە دەبڕین.

بەبێ هیچ دوودڵیەك وتی:

– زۆر چاکە.

ئەمـە گـەورەترین شـۆكو سەرسـوڕمانی ژیـانم بـوو، نەمـدەتوانی لەمێشـکمدا جێـی بکەمـەوە کـە شـتێکی وەهـا لـەم دونیایـەدا بـوونی هەیە، چونکە یەکەمجارم بوو تووشی چاکەیەکی بـێ بەرامبـەری لـەو شێوەیە ببم.

ئەمانە ئەو شتانە بوون کە بـەدونیای مـن ئاشـنا نـەبوون، لای مـن هەموو شتێك پارەو بەرژەوەندی بوو، ئەگەر پارە نەبوایە هیچ کارێـك بـۆ هـیچ کەسێك نـەدەکراو بەژەوەنـدی نەبوایـە چـاکە لەگـەڵ کـەس نەدەکرا...

ئـەو دکتـۆرە ترسـناکە، ڕوو گـرژە لەبەرچـی مانگانـە ئـەو هـەموو پارەیەی بۆ من خەرج دەکرد، ئایا ئەو کابرایە شێت بووبوو؟

واسـەرم لێشـێوابوو، کەنەمـدەتوانی واتایـەك بۆئـەو هەڵسـوکەوتە بدۆزمەوە...

تەنانەت بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەکەش زۆر سەریان سوڕمابوو لێیان پرسیبوو:

–جەنابی دکتۆر، تۆ دڵنیایت لەو بەڵێنەی کەداوتە؟

ئەویش وتبوی:

–بەڵێ، هەروەك چۆن بەڵێنم داوە.

دووبارە نەیانتوانیبوو تێبگەن.

–ئەی خزمتە؟

–نەخێر!

–کەواتە، دۆستێکی ناسیاوتە.

– ئەویش نییە.

– کەواتە لەبەرچی؟

ئەو سەری داخستبوو و بۆ ماوەیەك بیری کردبوویەوە، دیاربوو لەسەری دا ڕەشەبایەکی نهێنی هەڵی کردبوو. دواتر وتبووی:

– تکایە ڕێز لە بڕیارەکەم بگرن.

لەو کاتەدا نازانن کە چۆن سوپاسم کردو چۆن مەمنونیی خۆمم دەربڕی و لێی پاڕامەوە.

تومەس لەپشت ئەم کارەوە مەبەستێکی هەبوو، بابەتەکە بەو شێوەیە نەبوو کە دیار بوو.

لەبەرئەوە بوو کە قورسترین و بەئازارترین سوپرایزەکانی ژیان چاوەڕێیان دەکردم.

ئەو ڕۆژە لەکاتێکدا کە من لێپرسینەوەم لەگەڵ ڕابردووی پڕ ڕەزالەتی خۆمدا دەکرد، ئەو دکتۆرە پڕ نهێنییە هاتە ژوورەوە.

لەکاتی تەداوییەکاندا هیچ قسەی لەگەڵ نەدەکردم و ڕووی پێنەدەدام، بۆ حاڵی پەرێشان و پەك کەوتووم هیچ دڵنەوایی نەدەکردم و هیچ زەردەخەنەی بۆ نەدەکردم. نەمدەتوانی بەهیچ جۆرێك لە کردەوەکانی تێبگەم.

دیسان برۆکانی دابوو بەیەکداو بەڕوویەکی گرژو مۆنەوە دەیڕوانی...

لە شێرێك دەچوو کە دەیویست لەفرسەتێکدا هێرشم بکاتە سەرو پارچە پارچەم بکات.

لەکاتێکدا کە چارەسەرەکەی تەواو کردو ویستی بڕوات وتم:

–جەنابی دکتۆر، نازانم هۆکاری ئەو چاکەیەتان چییە کە لەگەڵمدا کردتان تائێستاش سەرم لەو کارە سوڕماوە، تێیش ناگەم کەبۆچی چاکەیەکی واگەورەتان لەگەڵ کەسێکی وەك مندا کرد کە هیچ نامناسن.

لەگەڵ ئەوەشدا دکتۆرێکی بەخشندەو بەسۆزی وەك ئێوە بۆچی لەهەمان کاتدا وەك دوژمنێك لێم دەڕوانیت؟

ئەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان ئەم دوو هەڵسوکەوتە، بەتەواوی مێشکی جەنجاڵ کردووم، ئایا هۆکاری ئەمە چییە؟

ئەگەر بەسۆزی خۆتان سەرپەرشتیم دەکەن، بۆچی وەك ئەوەی گیانم بکێشن ترسم لێ دەنیشێنن، ئەگەریش لەم هەستە دوژمنکارانەتاندا ئامانجێکتان هەڵگرتووە؟ بۆچی ڕێگەتان نەدا فڕێم بدەنە دەرەوە؟

تکایە من لەم ئازارە ڕزگاربکەن.

دەستکێشەکانی داناو لەبەرامبەرمدا دانیشت، بۆماوەیەك بە زەردەخەیەکی پڕ ئازارەوە لێی ڕوانیم.

ئەو سەیرکردنانە وەك ئەوەبوو بەکەسێك بڵێیت "ئۆخەیش" کە بەر لەعنەتی خەڵکی کەوتیتو لەژێر پێدا دەتلێیتەوە.

وتی:

–سەیرکە موڕات! بەدەنگێکی ڕەق وەك بڵێی دەیویست بە هەناسەیەك هەرچی ڕقو قینی ناخێتی بشارێتەوە.

باشترە تۆ ئەو پرسیارە نەکەیت، منیش وا دادەنێم گوێم لەهیچ نەبوو، ئەگەر وا لەمن بکەیت قسەبکەم، دوایی زۆر دەڕەنجێیت نەك هەر ڕەنجاندن، بەڵکو دەڕوخێیت، پێش ئەوەی دونیا بەجێ بهێڵیت، لەدونیادا ئازاری دۆزەخ دەچێژیت.

بــۆ ســاتێك لــەرز دایگــرتم، ترســام، ئــەو ســەرنجانەی کــە لەچـاوەکانیەوە دەرچـوون وەك ئـەوە بـوون گیـانم بکێشــن، وەك ئەوەبوون گیانو ڕۆحم کون کون بکەن.

سەرەڕای ئەوەش سووربووم لەسـەر داواکـەم و بەقسـەکەی خـۆمم بردە پێشەوە، چیتر نەمدەتوانی بەرگەی ئـەو ئـازارە بەرگـە نەگرانـە بکرم، وتم:

–بیلێن... تکایە بیلێن، دەبێت چی هەبێ زیـاتر لـەم حالـەی ئێسـتام ئازارم بدات؟

بەخەمێکەوە سەری لەقاندو وتی:

– خۆت دەزانیت: مادام زۆر حەز دەکەیت پێت دەڵێم بێگومان ئەگەر ویژدانێکت بۆ بەرگەگرتن هەبێت! بۆڕزگـاربوون لـەو سـەرنجانەی کـە دەیانویست هەڵبکوتنە سەرمو پارچە پارچەم بکەن، سەرم داخسـتو دەسـتم کـرد بـە گـوێ گـرتن لـە ڕسـتە سـووتێنەرەکانی کـە لـەزاری دەکەوتنە خوارەوە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە وتی:

– من خوشکێکم هەبوو، چـوار سـاڵ لـەمن منـاڵتربوو، کچـی تاقانـەی ماڵـەوەبوو، دڵخـۆشو پڕژیـان بـوو، خـەیاڵی بـۆ دواڕۆژ هـەبوو، ئـەو فریشتەیەکی سادەو پاك بوو کە بـاوەڕی بەهـەموو قسـەیەك دەکـردو نەیدەزانی فێڵو درۆ چییە.

ئەوم ئەوەندە خۆشدەویست کە جگە لەخوشك، هاوڕێو هاوڕازیشم بوو، ئەو ڕۆحی دووەمم بوو کە لەخۆم خۆشتر دەویست، لەبەرئەوەی زۆر زیرەك بوو، باوکم دەیویست ببێتە پزیشكو یارمەتی نەخۆشەکان بدات تا ببێتە خاوەنی دوعای گیرای ئەوان. دایکیشم ئەوەندە ئازاری بەدەست نەخۆشییەوە چەشتبوو، هەمیشە دەیوت:

–کچم پێویستە تۆ ببیتە پزیشك، بەڵام هیچ کات ئازاری کەس مەدەو لەکەس تووڕە مەبە، سەرەتا بەڕوویەکی خۆشەوە گوێیان لێ بگرەو، دڵنەواییان بکەو ورەیان بەرز بکەرەوە.

ئەو غەریبانەی کەلەئازاردا دەسوتێنو دێنە نەخۆشخانە بۆ کەیف و سەفا نەهاتوون.

نەخۆش بەچارەسەری پزیشك چاك نابێتەوە، بەڵکو بە زمانی شیرینو هەڵسوکەوتی باش چاك دەبێتەوە، بەو شێوەیە دڵەسوتاوەکانیان بۆ سەهۆڵ دەگۆڕێتو ئازارەکانیان دەڕەوێتەوە.

دایکمو باوکم و من خەیاڵی زۆر جوانمان بۆ خوشکەکەم هەبوو، ئەو هەواڵە نامرۆڤانەیەی کەژیانی گۆڕی بۆ دۆزەخ وەك تۆپێك ئاگر کەوتە ماڵمانەوەو هەموومانی سوتاند.

بەنرخترین ئەندامی ماڵمان، منداڵە بچوکەکەمان، خۆشەویستی خێزانەکەمان لەلایەن خائینێکی وەحشییەوە دەستدرێژی کرابوویە سەر.

دکتۆرەکە نەیتوانی زیاتر خۆی ڕابگرێت، بەدەستەکانی دەموچاوی داپۆشــیو وەك منــداڵ دەســتی کــرد بەهەنســك دانو دەیکێشــا بەئەژنۆکانیداو دەگریا.

هەرچی منیش بووم بێ هەناسەدان گوێم گرتبـوو تـا بـزانم لەکوێـدا ڕووداوەکە دەبەستێتەوە.

بەچاوێکی پڕ لە ڕق و توڕەییەوە لێـی دەڕوانـیم وئـەو بریسـکانەی کە لەچاوەکانیەوە دەردەچوون دەبوونـە چـەقۆیەکی تیـژو بـەردەوام بوون لەپارچەپارچەکردنم.

-کاتێـك گەیشـتم بەخوشـکەکەم، نـەیتوانیبوو بەرگـەی ئـەو کـارە دڕندانەیە بگرێت کەبەسەریدا هاتبوو لەشۆکی ئەوەدا هۆشی لەدەست دابوو مەچەکی خۆی بڕیبوو.

ئەو کچە دڵ پاکەی کەبۆ داهاتووی چـەندەها خـەیاڵی پـڕ جـۆشو خرۆشــی هــەبوو نــەیتوانیبوو بەرگــەی ئــەو دەســتدرێژییە بگرێــتو دەستی چووبووە گیانی خۆیەوە..

دایكو بـاوکی بێچـارەم نـەیانتوانی لـەژێر کاریگـەری ئـەو ڕووداوە دڵتەزێنە دەربچن، دایکم خۆی زەختی بەرز بوو، بەیانیـەك هەسـتاین، بینیمـان لەجێگەکـەی خۆیـدا گیـانی سـپاردبوو، باوکیشـم بەتـەواوی کـۆنترۆڵی خـۆی لەدەسـت دا و ماڵەکـەمان بـەردەوام خەریکـە گـڕ دەگرێت.

ئەم وەحشەتەی کەڕۆحو دڵو مێشکمی لێ سەندمو ژیانمی کردە وێرانە، وەك خەنجەر دڵمی پارچەپارچە کرد.

دکتۆرەکە نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگەی ئاگرەکەی ناخی بگرێت، لەناکاو هەستایە سەر پێو پەنجە لەرزۆکەکانی بڕییە چاوەکانمو وتی:

–ئەو مرۆڤ کوژە، ئەو وەحشییە، ئەو جانەوەرە، دەزانی کێ بوو؟ ئەوە تۆبوویت کەئێستا لەبەردەممدا وەك پارچە گۆشتێك بەپەند بوویت و کەوتوویت.

بەهاوارەوە قسەی دەکردو هۆشی لای خۆی نەمابوو.

باوکت وایدەزانی دەتوانێت بەدەوڵەمەندیەکەی هەموو شتێك چارەسەر بکات، بەڵام ئەو حسابی بۆ پەروەردگاری باڵادەست نەکردبوو، خوای گەورە کاربەجێو دادپەروەرە و سزای لەسزای مرۆڤەکان ناچێت، ئەگەر کەسێك ڕسوابکات، بۆ هەموو دونیا دەیکات بەپەند.

سەیری ئەو ئیشەبکەن، بکوژی خوشکەکەم کەوتۆتە دەستمو داوای یارمەتیم لێ دەکات، ئای پەروەردگارم! ئابەمە دەڵێن پەندو دادپەروەری.

ئەمە تەنها سزایەکە کە لەدونیادا دەیچێژیت، بەڵام سزای ڕاستەقینە لە دۆزەخ دەبێت، ڕەنگە ئێستا ئەو ئاگرەی بۆ سوتاندنی تۆو نموونەکانی وەك تۆ ئارامی لەبەربڕابێت.

لەو کاتەدا یەکێك لەو تاوانە گەورانەی کەلەڕابردوودا ئەنجامم دابوو لەشوێنێکدا کەهیچ چاوەڕوان نەبووم هاتە بەردەمم و بوویە سەرەتای ڕووخانم.

بەڵام چۆن ڕووخانێك بوو خوایەگیان!

ئەو حاڵەتەی تێی کەوتبووم، وێنای بێ چارەیەکی دەکرد کەلە چۆڵەوانییەکدا کەوتبێتە دەست جانەوەرە دڕندەکانەوەو هەموو ئومێدی لەدەست دابێت.

هەرچی هێزێکم پێ مابوو کۆمکردەوەو تاتوانیم هاوارم کرد:

–بمکوژە! من چیتر بەرگە ناگرم، بمکوژە، تکادەکەم دەرزییەکی ژەهراویم لێ بدە، با چیتر مرۆڤێکی وا نەژی، مەهێڵە ئەم تاوانبارە لەوە زیاتر بژی، دەی دەرزییەکم لێ بدەو ڕزگارم بکە.

تکایە... تکایە ئەم چاکەیەم لەگەڵ بکە...من بەهەموو جۆرە مردنێك ڕازیم ئەگەر دەڵێیت بە چەقۆیەکی کول پارچە پارچەم بکە، ئەگەر دەڵێیت سەرم بشێلە، چۆن حەز دەکەی ئاگرەکەی ناخت بکوژێنەرەوە بەو شێوەیە بکە، ئەگەر نا ئەمە دەبێتە سەختترین خەفەت.

دکتۆرەکە تەنانەت ئاوڕیشی لەناڵەو هاوارەکەم نەدایەوە، هاواری کرد:

-تۆ پێویستە بژیت، پێویستە ببیتە پەند، پێویستە بژیت تا زەڕە زەڕە بتوێیتەوە، بۆ ئەوەی هەموو ئانو ساتێکت مردن بێت، بۆئەوەی وەك مەعشوقێك چاوەڕێی مردن بکەیت... تۆ پێویستە بژیت تا تەمەنێك لەناختدا هەست بەئازاری ئەو منداڵە زوڵم لێکراوانە بکەیت کە تۆ بکوژیان بوویتو شێت ببیت.

نابێت مردن وەك ڕزگارکەرێك بەدەست بهێنیت، بۆئەوەی ئازاری ئەو لەهەموو دەمارەکانتدا هەست پێ بکەیتو ئازار بچێژیت. هەروەك چۆن تۆ ژیانی دەیەها کچت ژەهراوی کرد، منیش هەرچی لەدەستم بێت دەیکەم تابتوانم تۆلەژیاندا بهێڵمەوە بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لەدڵتدا هەست بەو ئازارە ترسناکانە بکەیت کە وەك ئاگر بڵێسە دەدەن.

فرێدانت بۆ دەرەوە و وەستان لەچارەسەرت گەورەترین خەڵات دەبێت بۆتۆ، مردنێکی ئاوا ئاسان بۆ دڕندەیەکی وەك تۆ کەمە.

ئەو ئازارە پڕ کینەیە کە جەنابی دکتۆر باسی دەکرد لەدڵمدا هەستم پێ دەکرد، ئەو ئازارەش بەشێوەیەك بوو پڕ ئەشکەنجە وەك چۆن کەسێك پێستی لاشەی لێ بکەیتەوە، پەنجەکانی ببڕیتو سەری بپەڕێنیت کەچی هێشتاش هەر نەمرێت... ئازارەکەی منیش هەر بەو شێوەیەبوو.

بۆ دانەوەی باجی ئەو ستەملێکراوانە کە دەستم چووە خوێنیان، ئاواتەکانیانم بەباداو، ناموسیانم لەکەدار کرد تەنانەت هەزار ساڵ سزاش هێشتا کەم بوو.

کاتێك پاڕانەوەو فەریادو بێ چارەیی ئەو کەسانەی کە خیانەتمان لێ کردن دەهاتەوە پێش چاوم، هەستم دەکرد کە هەموو دەمارەکانم هەڵدەوەشێن‌و ئەندامەکانم پارچە پارچە دەبن‌و هەستەکانم هەزارەهاجار تامی مردنیان پێ دەکردم.

ئێستاش لێرە، لەم نەخۆشخانەیەی کە ئەو دکتۆرە خەرجیم دەکێشێت هەموو ساتێك چاوەڕێی ئیزرائیل دەکەم.

## ئای مردن! وەرەو ڕزگارم بکە!

کەواتە گەورەترین ئازار بۆ کەسێکی تاوانبارو مەلعون لە کۆتا ساتەکانیدا نەمردنیەتی.

کەواتە هیچ شتێك بەقەدەر نەمردن ڕووداوێکی ناخۆش نییە، من ئێستا چاوەڕێی مرۆڤێکم بێت‌و بمکوژێت، ئەگەر کەسێکی وادەربکەوێت من ئامادەم دەست‌و قاچی ماچ بکەم، و خۆم بەقەرزارباری بزانم.

تەنانەت ئەگەر پیاوکوژێکی دڕەندەش بێت، بەڵام ئایا دەستی بەخوێنی مرۆڤێکی ڕیسوای وەك من سوور دەکات؟ ئەو پیاوکوژەش

خۆی بۆخۆی ڕێزێکی هەیە، دڵنیام نایەوێت لەخوێنی پیسی منەوە تێوە بگلێت.

هەر لەبەرئەوەشە دوژمنەکانم ڕقیان لێمەو دەیانەوێت لەژیاندا بمێنمەوە، هەرچی دۆستەکانیشمە تەنانەت بەبیستنی ناوەکەشم بەبەردەمی دەرگای ژوورەکەشمدا ناڕۆن.

ئەو پەرستارانەشی کە دێنەلام... وەك بڵێی دەست لەمارێکی ترسناك دەدەن بەو شێوەیە قێز دەکەنەوە.

من هەست بەوە دەکەم تیایاندا..

بەڵام ئەوان ناهەقیانە؟

نەخێر!

من دەمێك بوو شایەنی ئەمە بووم.

وەك ئەوە وایە دەورروبەرم پڕ بێت لەمەخلوقی ترسناك کەتەنها من دەیانبینم... لەنێو ئازارێکی سەختدا دەتلێمەوە، هەموو شتەکان بەمندا نوقوم دەبن‌و ناخم ڕەش دەکەنەوە.

ئەم ژیانە پڕ ئازارە بۆمن قورساییەکە کە لەژێریدا دەتوێمەوەولەناودەچم.

ڕەنگە ئەمانە کۆتا قسەو گوفتارو کۆتا هەناسەی من بن .

ئەی گەنجەکان!

ئەی مرۆڤەکان!

تکاتــان لــیٚ دەکــەم گــویٚم لــیٚ بگــرن.. بەســەرهاتی ئــەم ژیانــە ناشیرینەی من بۆ هەمووان بگێڕنەوە.

هیچ کات بەپارەو هێزو گەنجیتان هەڵمەخەڵەتێن، لەبیرتان نەچێت هەموو شتێك کۆتایی هەیـەو لێپرسینەوەشـی هەیـە، بـزانن کـە ئـاهی سـتەم لێکــراوانو بــیٚ گوناهــان بەشــێوەیەکی ترســناك یەخــەتان دەگرێت، وامەزانن ڕزگارتان بووە کاتێك کە لەدەستی یاسا هەڵدێن.

لەبیرتان بێت دادپەروەری ئیلاهی هەیە.

با ئەمە وەسیەتی من بێت بۆتان.

(ناوەکان خوازراون)



# هاوسەرەکەم بەکەم زانی

**گوناهێکی گەورەم ئەنجامدا..**

**مــن وەك ژنێکــی گــەنج کــەژیانم بــۆ دۆزەخ گــۆڕاوە، ئێســتاکە بیردەکەمەوە؛ من تەمەنێك باجی ئەو هەڵانە دەدەمــەوە کــە ئــەنجامم داون، ئەویش لە قەهری کەسێکدا کە تووشی گوناهی گەورەبووە.**

**دڵنیام کەم تازۆرێك درامای ژیانی بەندەیەکتان دێتە پێش چـاو کـە نە ڕووی لای مرۆڤەکان و نەڕووی لای پەروەردگاری ماوە.**

**لەنێو ئازارێکی دڵتەزێندا دەژیم، پێش ئەوەی بمرم دۆزەخ بەچاوی خۆم دەبینم.**

هاواری من چیتر بۆخۆم نییه، بەڵکو بۆئەوانەیە کەلەدوای من دێن، تکایە باچیرۆکی من ببێتە وانەیەك بۆئێوە...

ئایا ئێوە دەپرسن چۆن دەبێتە وانە؟!

با بۆتان باس بکەم:

من وەك کچێك کە لەزانکۆ وەرنەگیرامو لەژێر ئاواتی خوێندندا مامەوە، بۆ ڕزگاربوون لەو داڕووخانە بڕیارم دا شوو بە پیاوێك بکەم کە باوکم دەیویست.

بەلام خۆزگە ڕازی نەبوومایە، هەموو شتێك لەو هەڵەیەمەوە دەستی پێکرد، من کچێك بووم بەگەنجیو شۆخو شەنگو جوانی ناسرابووم، هەرچی ئەو کەسەش بوو کە بەنیازبووم شووی پێ بکەم دوازدە ساڵ لەمن گەورەتربوو و کەسێکی قەڵەوبوو.

من لەگەڵ ئەو پیاوەدا کە پیاوی خەونەکانم نەبوو، تەنها بۆ ڕازیکردنی خێزانەکەم هاوسەرگیریم کرد، خراپییەکەی ئەوەبوو کە هەرچیم بکردایە نەمدەتوانی خۆشم بووێت، بێگومان لەو ماڵەدا کە هیچ ئاسەوارێك بۆ خۆشەویستی نەبوو، زۆر دڵم تەنگ بوو.

خێزانەکەمو مێردەکەشم بەمەیان دەزانی. چەند جارێك هەوڵی وەرگرتنی تەلاقو ڕاکردنو تەنانەت خۆکوشتنو ڕزگاربوونیشم دا، بەلام پێش لەدایك بوونی کچەکەم بەتەواوی مەحکومی ئەو ژیانە

ناچـارییە بـووم بـەهۆی ئەوەشـەوە هـەموو خـەون‌و چـاوەڕوانی‌و حەسرەتەکانی گەنجێتیم چوونە ژێر گڵ.

بەهۆی ئەو جیاوازییە زۆرەی تەمەن و، سەختی ژیان لەگەڵیدا کە نەیدەتوانی لێم تێبگاتو لەگەڵم سارد بوو مێشکو فیکری لەبەر هەڵگرتبووم.

ئەو شتانەی ڕوویاندا کە نەدەبوو ڕوویدەن، هەڵەکان لەمێشکمدا دەستیان بەجووڵە کرد.

چۆن دەتوانم لەم کابرایە ڕزگارم بێت؟

بیکوژم‌و دواتر بڵێم ڕووداوێك بوو؟

لەکاتێکی دیاری نەکراودا لەماڵەوە ڕابکەم؟

یاخود بەرەو ڕوو پێی بڵێم: "من تۆم خۆش ناوێت"و زۆری لێ بکەم تا تەڵاقم بدات.

سیناریۆی زۆری لەوجۆرە لەمێشکمدا دەسوڕانەوە.

ئەو ڕۆژەی ئەو بابەتەم لای دایکم درکاند قیامەتی هەڵگیرساندو وتی:

–ئەگەر لەوماڵەدا هەر غەڵەتێك بکەیت، دەرگامان بەڕووتدا دادەخەین تەنها بەمردوویی دەبێت لەو ماڵە بێیتە دەرەوە، تۆ هیچ چارەیەکی ترت نییە جگە لەوەی ببیت بە دایك بۆ کچەکەتو ببیت بەهاوسەر بۆ مێردەکەت.

ئەمە وەك ئەوەبوو هەموو ژەمێك ئەو خواردنە بخۆم كە ڕقم لێیەتی.

لەكاتێكدا من بۆ دەرچوون لەو ژیانە پڕ نەهامەتیەدا بۆ ڕێگایەكو سەرەداوێك دەگەڕام، بەڵایەك كە لەحسابدا نەبوو، هاتە سەر ڕێمان...

ڕێك لەبەرامبەر ماڵماندا مامۆستایەكی گەنجو جوان بووە دراوسێمان، لەسەرو ئەمانەشەوە هاوسەرگیری نەكردبوو.

هەڵەكانی ژیانیشم لەوكاتەوە دەستیان پێكرد، كە ئەو مامۆستایەم ناسی، ئایا ئەوە ئیش بوو ژنێكی ئاقڵو بەناموسو هاوسەردار بیكات!

سوپاس بۆ خودا ئەو گوناهە گەورەیەمان ئەنجام نەدا، بەڵام قسەو باسمان بەناو گەڕەكدا بڵاوبوویەوە.

ئەو بە بەڵێنی "دەتخوازم" بیرو هۆشی لەمندا نەهێشتبوو، شەیتانو نەفسم یەكیان گرتوو منیان فڕێ دایە ناو ئەو چاڵی دۆزەخەوە، كە تائێستاش بەبڵێسەی ئاگرەكەی دەسووتێم.

ئامۆژگارییەكانی دایكم هیچ كاریگەرییەكیان لەسەرم دروست نەكرد، پوورە فاتیمەی دراوسێشمان تەجروبەی ئێستاو ڕابردووی خۆی لەگەڵمدا دابەشكردو پێی وتم:

-کچی خۆم کاری وەها مەکە! تۆ بەم کارەت هەم خۆت هەم منداڵەکەشت دەسووتێنیت، تەنانەت خراپترین هاوسەریش لە مێبازێکی بێگانە باشترە، ئاگات لەناموست بێتو بیپارێزە.

بەڵام لەکوێ بوو ئەو ئەقڵەی من کە لەو قسانە تێ بگات، هەستە کوێرەکانم گوێیان لە ئاست ڕاستیەکاندا داخستبوو و، بەئازاییەوە بەسەر گوناهەکاندا دەڕۆیشتن.

هاوسەرەکەشم ئەو قسانەی بیستبوو بەڵام هیچی نەدەوت، ڕەنگیشە پیلانێکی جیاوازتری هەبووبێت، بەڵام لە هەموو هەڵسوکەوتەکانیدا دیاربوو کە زۆر بێ تاقەت بووە، ئەو کەسێکی تێگەیشتوو بوو خاوەنی ڕێزبوو، بەدڵنیاییەوە نەیدەتوانی ئەوە قبوڵ بکات، بەڵام من بەتەواوی لەخۆم دەرچووبووم بەشێوەیەك کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دابوو کە بیرم لەئەنجامی کارەکانم نەدەکردەوەو بووبوومە ئەسیری هەستەکانم.

هاوسەرەکەم لەو فەرمانگەیەی کاری تێدا دەکرد جەڵتەی دڵ لێی دابوو وەفاتی کرد، ڕەنگیشە بەهۆی ئەو قسەو قسەڵۆکانەوە نەیتوانیبێت بەرگە بگرێت، کاتێك خۆمو خێزانەکەم ڕووبەڕووی ئەو حسابە بووینەوە ئەو کات لەو گومانانە تێگەشتم، ئەو مامۆستایەش کە بەحساب عاشقم بوو بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆی ئەو ناوەی بەجێهێشت.

لەو کاتەدا کە بابەتەکە گۆڕا بۆ شەرمەزاریی ناموس، دایكو باوکم پشتیان تێ کردم، کچەکەمیان بردەلای خۆیانو منیشیان بەتەنیا لەگەڵ گوناهەکانمدا بەجێ هێشت.

ئەم داڕووخانی ئاواتو ترسە تۆقێنەرە بەتەواوی حاڵەتی دەروونیان تێکدامو زۆری نەخایاند هاوسەنگی مێشکم لەدەستدا.

لەناو ژوورێکدا وام دەزانی لەگەڵ چەند جانەوەرێکی بێ بەزەییدا تەمەنم بەسەردەبەم بەوشێوەیە ئازارم دەچەشت.

لەنێو نەخۆشخانەی دەروونیدا بۆماوەی دووساڵ چارەسەرم وەرگرت، لەناو ئەو مرۆڤانەی کە بەتەواوی عەقڵیان لەدەست دابوو، هەوڵی کۆکردنەوەی بیرو هۆشی خۆمم دەدا.

دواتر لە نەخۆشخانە دەرچووم، بەڵام خۆزگە دەرنەچوومایە، خۆزگە لەناو ئەو چوار دیوارەدا تەمەنم بەسەر ببردایەو باجی هەڵەو تاوانەکانم هەر لەوێدا بدایە.

دەتوانم بۆ کوێ بڕۆم؟ لەدوای ئەو لەکەیەی کە دروستم کرد بۆ دایكو باوکم چیتر نەمدەتوانی بگەڕێمەوە بۆلای ئەوان، تەنانەت نەشم دەتوانی بگەڕێمەوە بۆ ئەوماڵەی کە تیایدا دەژیام.

ئەی حەسرەتی کچەکەم؟! چۆن باسی خۆشەویستیو کسپەی دەروونی خۆمتان بۆ بکەم؟

بە بۆنەی ئەو گەنجەوە کە تووشم بوو، کەوتمە حاڵێکی زۆر ناهەموارەوە. هەموو ڕۆژێك هەزار جار دوعام دەکرد "خودایە گیان بمکوژە!"

مەگەر مردن چەندە ڕزگارکەرێکی جوانە! هاوسەرەکەم لەبەرئەوەی نەیتوانی بەرگەی گوناهەکانی من بگرێت دونیای بەجێ هێشت، ئەو بەو شێوەیە ڕزگاری بوو، هەرچی منیشە دەجار لەو زیاتر ڕقی مرۆڤە ناشیرینەکانم چەشت، ئێستاش بەئاهی ئەوەوە لەناو دەچم.

ئەوە دوو ساڵە لەنەخۆشخانەم، تووشی نەخۆشییەکی زۆر ترسناك بووم، واتە هیوای ڕزگاربوونم نییە، ڕەنگە ساڵێك یاخود کەمتر لەوەش دەتوانم بژیم.

بەحەسرەتەوە چاوەڕوانی مردن دەکەم، مردن ئاسانە بەڵام باجی زۆرم لەسەرە کە دەبێ بیدەم.

وەك کچێکی گەنج کە لە بێئاگاییدا بووم تەنها بە سووتان لەگوناهەکانمدا نەوەستاوم، ئێستاش ترسی دواڕۆژم لێ نیشتووە.

حسابی دایكو باوکم، حسابی ئەو کچە بێ تاوانەم کەلەنێو ئەو قسەوقسەلۆکانەدا گەورە دەبێت و، حسابی ئەو هاوسەرەم کە لەداخی من تیاچوو...

خوایەگیان من چۆن ئەو بێ عەقڵیەم کرد، من چۆن بیرم لەحسابی ئەو کارە شێتانەیەم نەکردەوە!

ئێستا ئەو دەستانەم کە لەگوناهەوە تێوەگلاون بەرزم کردونەوەتەوە بۆلای پەروەردگارو بەوزمانەی کە بەگوناه پیس بووە لێی دەپاڕێمەوە هەرچەندە دەزانم کە ئەو لێبوردەیە، بەڵام ئایا لە کەسێکی وەك من خۆش دەبێت کەبوومە مایەی لەکەدارکردنی ناموسو عیفەت.

لە حزووری ئەو زاتەداو بەکۆتا ئومێدەوە شەو تا بەیان فرمێسك دەرێژم...

بۆچی ئەم چیرۆکەم باسکرد؟

بۆرەواندنەوەی ئاگری ناخم نەبوو، بەهیچ شێوەیەکیش بۆ دەرخستنی گوناه نەبوو.

بەڵکو مەبەستم ئەوە بوو کە ئەو کچە گەنجانەی ئەم چیرۆکە دەخوێننەوە بزانن کە ناموسو رێز گەورەترین دەوڵەمەندی ژیانی مرۆڤن ئەگەر لەناوچوون، ژیانیش لەناودەچێت.

تکایە ئەمە لەبیرمەکەن!

(ناوەکان خوازراون)



## لەبەرئەوەی بە بەردەوامی

## چاو لەدەربووم ژیانم بوویە زیندان

تۆ بڵێی بەندەیەکی تری پەروەردگارھەبێت کە هێندەی من گەنجێتی بە لاساریی بەسەر بردبێتو بێ باکانە گوناهی ئەنجام دابێتو باجی هەڵەکانیشی بەقورسترین شێوە دابێتەوە؟

لەوەتەی هەم نەمتوانیوە بەو نەفسە کوێرەم بڵێم: "بوەستە!" نەشم توانی بەرەنگاری ئەو شەیتانە ببمەوە کە لەمێشکمدا فەرمانی بەسەردا دەدام.

وەك گەنجێکی چاو لەدەر گوناە کردن وەك خویەك لەناخمدا ڕەگی داکوتیبوو.

چەندەها جار تەوبەم کردو سوێندم خوارد، بەڵام نەمتوانی ئەو شەیتانە نەفرەتییەی ناخم بێ دەنگ بکەم.

جا چیی بەسەرمدا نەهات ؟

بابۆتانی باس بکەم:

ڕەنگە ئەم بەسەرهاتەی من سەرنجی گەنجێك ڕابکێشێتو بەهۆیەوە لەو پردی گوناهانە نەپەڕێتەوە کە منی پیادا تێپەڕ بووم، ژیان لەخۆی نەکاتە زیندان، ئەگەر چی لەکۆتا نەفەسیشدابم بەڵام هەر بەچاکە لەقەڵەم دەدرێت.

ئەو کاتەی لەعەسکەری گەڕامەوە، کاتێك باوکم بینی لەگەڵ ڕەشەبا شێتەکاندا کەوتومەتە جەنگەوەو بەهیچ شێوەیەك عاقڵ نابم، لەگەڵ کچە مامەکەمدا هاوسەرگیری پێ کردم کە باشترین دونیابوو و نموونەی ڕەوشت بەرزیو خاتوونێکی دینداربوو.

بەو شێوەیە من تەنها دوو مانگ توانیم لەگەڵ ئەو کچە بێ دەنگو گوێڕایەڵو بەماریفەتەی کە لەژیانیدا دڵی کەسی نەڕەنجاندبوو بژیم.

بەبیانووی "دەڕۆم بۆ کارکردن" ئەو جوانیە دڵڕفێنەی "کارا دەنیز"م جێهێشتو لەکۆڵانەکانی ئێستانبوڵدا شوێنێکی حەوانەوەم گرت.

کارێکی خراپ نەما کە نەیکەم، هیچ شتێك نەما لووتی تێوەرنەدەم، هیچ پیسییەك نەما تێوەی نەگلێمو گوناه نەما نەیکەم،

بیستوتانه که دەڵێن: "تۆ پێم بڵێ هاوڕێکەت کێیە! منیش پێت دەڵێم تۆ کێیت"... ڕێك بەو شێوەیە بوو..

هاوڕێکانم هەموو چاو لەدەربوون، هەستیاری ناموسیان لەدەستدابوو، باوەڕیان لەدڵیاندا دەرهێنابوو، ڕێزی مرۆڤایەتیان سفر کردبوویەوەو حەڵاڵو حەرامیان تێکەڵ کردبوو بەسەریەکدا...

هاوسەرە ڕاستگۆو بەئەمەكو فریشتە ئاساکەی منیش، چاوەڕێی گەڕانەوەی من بوو، ئەو بێچارەیە...

## ڕێك ماوەی هەشت ساڵ!!!

من لە کۆڵانەکانی ئیستانبوڵدا دەمێك بوو خۆم لەدەست دابوو، بەڵام هاوسەرەکەم ماوەی هەشت ساڵ چاوی لەڕێم بوو و چاودێری دایكو باوکە نەخۆشەکەی منی دەکرد.

دەی... قابیلە حاکمی کائینات لە هەموو ئەو ناحەقی و گوناهە خۆش ببێت؟

ئایا لێپرسینەوەم لەگەڵ ناکات لەسەر ئەو بێ وەفاییەی کە لەگەڵ ئەو ژنە بێ تاوانەدا کردم؟

ئایا بەدوعای ئەو دایكو باوکەی لە سەختترین کاتیاندا و لەگەڵ نەخۆشیەکانیاندا بەتەنیا جێم هێشتن خودا ژیانم لێ هەڵناگێڕێتەوە؟

کەواتە بەمەیان دەوت "زللەی میهرەبانی"

لەپێوانەی مندا، لەگەڵ چەند خانمێک کە کەوتبوونە سەرجادە پەیوەندی ساختەم هەبوو، بەڵام هەموویان کاتێک زانیان نابمە مێردێکی بەقازانج، شەقێکیان لەمنداو ڕۆیشتن.

ئەو ساڵانەشی کە لەو کۆڵانەدا بەسەرم برد، نەک تەنها بیروباوەڕو مێشکم بەڵکو لەشی ساغیشمی لەگەڵ خۆیدا برد.

تێگەیشتم کەمیوەی ڕێگا حەرامەکان زۆر بەئازارە، زۆریش بەژانە ئەگەرچی یەکەم پارووی هەنگوینی ژەهراوی شیرینیش بێت، دواتر هەر ترس بڵاودەکاتەوە.

جگەرو، سییەکانمو، گورچیلەکانم وەک ئەوەی پەیمانیان بەستبێت دەستیان خستە ناو دەستی یەکو دانە دانە بەجێ یان هێشتم، چیتر وام لێهاتبوو نەمدەتوانی بەپێوە بوەستم، تەنانەت قرانێکیش پارە لەگیرفانمدا نەمابوو، جگە لە فرسەتچیو دووڕووەکانی دەوروبەریشم بەندەیەکی خوام شک نەدەبرد کە هاوکاریم بکات.

چیتر ترس لەوەی کە ئیزرائیل هەموو شەوێک سەرم لێ دەدات ژیانی لەبەر هەڵگرتبووم، لەناخمدا هەستم بەو بەرکەوتنە ساردانەی مەرگ دەکرد.

لەناو بۆنی کەڕووداو لەگەڵ چەند پارچە سەمونێکی ڕەق بوەوەدا ئازارێکی زۆرم دەچەشت.

تەنانـــەت زمـــانم نەیـــدەتوانی لەپـــەروەردگار بپاڕێتـــەوەو داوای چارەیەکی لیٚ بکات! لەدوای ئەو هەموو هەڵەو گوناهە بـەکام ڕووەوە بم کردایە؟

بـەکام ڕووەوە بگەڕامایەتـەوە بۆلای ئـەو هاوسـەرەی کـە مـاوەی هەشت ساڵ بەشەوقیی تازە بوکێکەوە چاوەڕێی دەکردم؟

ئایا لەوە زیاتر حەقی ئەوەم هەبوو کە دونیا پاکەکەی پیس بکەم؟

یاخود چۆن بمتوانیایە، لە کۆتا ساتەکانی تەمەنمدا وەك منـداڵێکی زاڵم ڕووبەڕووی دایكو باوکم ببمەوە؟

نەخێر! من پێویست بوو لەگەڵ گوناهەکانمـدا بەتـەنیا بمێنمـەوە؟ پێویست بوو بـاجی ئـەو هەڵانـە بدەمـەوە کـە ئـەنجامم داون، دەبـوو لەگەڵ ئەو نەخۆشیانەی کە خەریك بـوو ژیانمیـان لـەناو دەبـرد لـەناو بچم.

لەکاتێکدا کە تەواوی ئومێدم لەهەموو شتەکان بڕیبـوو و چـاوەڕێی ئەجەلی خۆم دەکرد، دەرگای تاکە ژوورەکەم کە لە قاتی ژێر زەمینـدا بوو کرایەوە.

## ئای خوایەگیان!

ئەو هاوسەرەم کە پاکیو دروستی ناو دڵی لەدەمو چـاویدا ڕەنگـی دابوویەوە، چاوە ماندووەکانی کە بریسکەیان لەبەربڕابوو بڕییە دەمو

چاوم، لەکاتێکدا کەمن چاوەڕێم دەکرد قورسترین وشـە لـەدوای یـەك ڕیزبکـاتو دەسـت بکـات بەئیهانـە کـردنم لەحەسـرەتی ئـەو هەشـت ساڵەدا، بەڵام ئەو سەرسامی کـردم بـەو سـۆزو ویژدانـەوەی کـە وەك تاوە باران ڕژا بەسەرمداو وتی:

-ئەی بەقوربانت بم! کەواتـە ئـەو کاتانـەی کـەمن لـە لەشسـاغیو سەفادابووم تۆ لەچاوەڕێی مەرگدا ئارەقت ڕشتووە وانییە؟

مەگەر من مردووم کەتۆ کەوتویتە ئەم حاڵەتەوە؟

ئینجـــا وەرە بەرگـــە بگـــرە، وەرە مـــەمرە! وەرە لەشـــەرماندا جەستەت نەبێتە هەزار پارچەوە.

سەیری ئەو ڕەزالەتە بکەن کە منـی تـێ کـەوتووم و ئـەو وەفایـەی هاوسەرەکەشم! بەڵێ، من ئەو جیاوازییە دیـارەی نێـوان ئیمانـداریو بێ ئیمانیم لەوێدا بینی.

سۆزی هاوسەرەکەم کە خۆی تەسلیمی پەروەردگاری کردبوو..

هەروەها ڕەزالەتی من کە لەپەروەردگاری مەزن نەترسابووم..

ئەمە بەس بوو بۆ شیکردنەوەی هەموو شتێك..

چ پێویست بە وشەی تر دەکات!

ماوەی دووساڵی ڕێك لەگەڵ برازاکەیدا لـە کۆڵانـەکانی ئیسـتانبوڵدا بەدوامدا گەڕابوون.

ئەو چەند پارچە ئاڵتونەشی کە لەکاتی بووکێنیدا بۆم کردبوو لەگەڵ خۆی هێنابووی.

منیان بردە نەخۆشخانە، ماوەی چوار مانگی ڕێك چارەسەریان بۆکردم، وەك فریشتە بۆ چرکەیەکیش بەجێی نەهێشتم، ئەو چاوە پڕسۆزانەی هیچ کات لەسەرم لانەبرد.

–چەندێکیش خراپ بیت، چەندیش گوناهت کردبێت، لەبیرت نەچێت تۆ هەرپیاوی منیت.

هێی کچێ! تۆ لەبەرچی ئەوەندە ڕاستگۆو ئەوەندە پاکیت، بۆچی ئەوەندە خاوەن بەزەییت!

باوکم هەمیشە سەبارەت بە هاوسەرەکەم دەیوت:

–کوڕم، ئەم کچە شیری حەڵاڵی خواردووە، کچی وەها کەم دەست دەکەوێت.

ئەو ڕاستی کرد.

گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام نەمتوانی فریای جەنازەی دایکمو باوکم بکەوم، ئێستاش تووشی شێرپەنجەی سییەکان بووم، بەهۆی باش کارنەکردنی جگەریشمەوە دەناڵێنم.

تەنها دڵنەواییم هاوسەرەکەمە کە وەك منداڵ دەمپارێزێت.

لەبەردەم چاکەو وەفاداری ئەودا هەموو ڕۆژێك دەتوێمەوە.

دەزانم ئەو ڕۆژانەی کە لەژیاندا ماومە سنووردارن، ئەو گوناهانەی کە هەستەکانمیان کوێر کردبوو دڵو مێشکم دادەپۆشن.

ناتوانم ڕووبکەمە پەروەردگارو داوای لێبووردنی لێ بکەم، زمانم ناجوڵێتو هەناسەم بەش ناکات.

هاوسەرەکەم دەستنوێژم پێ هەڵدەگرێتو بەئاماژە نوێژم پێ دەکات، بەڵام هەست بەو لەزەتو ئارامیەی جاران ناکەم.

لەمە ناخۆشترو قورسترو لەمە کێشمەکێشتر وانەی ژیانە!! ناتوانم باسی ئەو برینە بکەم کە لەڕۆحمدا دروست بووە لەئەنجامی خۆ ئامادەنەکردنم بۆ مردن کە وردە وردە بەرەو ڕووی هەنگاو دەنێم.

لەم چیرۆکەدا بێ چارەیی خۆمم بۆ گەنجەکان گێڕایەوە، وەك کەسێك کە هەمیشە چاو لەدەرو بێ باکانە بەرەو گوناه هەنگاوی ناوە، وەك کەسێك کە دووچاری دوعای بەدی دایكو باوکی بووەو خیانەتی لەهاوسەرەکەی کردووە...

لەکۆتاییدا هەموو ڕێیەکی خراپ بە ئێرە دەگات.

لەبیری نەکەن ئەی گەنجەکان!!

ئارامی دڵو خۆشی ژیانو بەرەکەتی تەمەن تەنها بەدوورکەوتنەوە لەگوناهەکانو پەیداکردنی پارووی حەڵاڵ دەبێت.

هیچ کات حەرامکراوەکان نابنە یار بۆتان!

خۆشەویستییە فانییەکانیش ڕۆژێك دێت بەجێمان دەهێڵن، گوناهەکانیش لەسەر پشتمان کەڵەکە دەبن.

باشترین ئافرەتانی دونیا ئەوەیە کە حەڵاڵتانە، هاوسەرەکەتانە، ئەگەر ئافرەتی نامەحرەم شاجوانی دونیاش بێت، وەك هەنگوینێکی ژەهراوی وایە، لەدواییدا هەست بەئازارەکەی دەکەیت.

تکایە چیرۆکی پڕ پەندی ئەم برایەتان بەهەمووان ڕابگەیەنن، لەوانەیە کەسێك هەبێت کە پێویستی پێ بێت..

(ناوەکان خوازراون)



# بمکوژن!
# من شایستەی ژیان نیم

من لێتان دەپاڕێمەوە...

تکایە با هەمووان ئەم چیرۆکەی من بخوێننەوە..

ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت لەهەڵەکانی ژیانو گوناهی بەندەکان وانەوەربگرنو ژیانیان ڕێکبخەنەوە، با سەیری حاڵی من بکەنو پەندی لیٚ وەربگرن.

ژیانی من بەجۆرێکە کە دەکرێت بۆ هەر کەسێك ببێتە ئەزموونی چەندین زانکۆ...

هەرکچێکی گەنج کاتێك لەسەرەتای لاوێتیدایە، خەون بە ژیانێکی خەیاڵی و ئەرخەوانییەوە دەبینێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی

مامەڵەکردن لەتەکیدا ئەستەم بێت. بەتایبەتیش ئەگەر ئەو کچە لەخێزانێکی هەژار بێتو لەناو شەرتو مەرجی ژیانێکی بێ چارەییەوە هاتبێت، ئەوا ئەو خەیاڵانە لەدەرەوەی ئیرادەو پڕ لەموعجیزە دەبن.

ژیانی منیش بەو شێوەیە دەستی پێکرد کچێکی بەدبەخت کە لەخێزانێکی بێ دەرەتانو لەناو ژیانێکی پڕ ئازاردا بەدوای ڕێگایەك و، سەرەداوێکدا دەگەڕا.

باوکم، کرێکاری بینا بوو، بەوپارەیەی کە دەستی دەکەوت نەیدەتوانی خەرجی ژیانمان دابین بکات.

دایکیشم بەهۆی زۆر کارەکەری کردن بۆ دراوسێکانو هەوڵی تەواوکردنی کارەکانیان، تووشی نەخۆشی گورچیلە هاتبوو.

خاوەنی چوار منداڵ بوون کە تەمەنیان لەیەکەوە نزیك بوو و،من گەورەی ئەو منداڵانە بووم.

لەجێگەی دایکم من دایکایەتیم بۆ ئەوان دەکرد، لەپازدە ساڵیمدا بووم وکەسێك بووم کە بە خەیاڵی خوێندنەوە دەسووتام.

سەرەتاییم بەهەزار دەردەسەری تەواو کرد، بەمەجبوریو بۆ هاوکاریکردنی خێزانەکەم نەمتوانی بڕۆمە ناوەندی، ئەوە دابڕان لە خوێندن بوو کە منی سوتاندو کردمیە خەڵوز.

بەرهۆیەوە هەستم بەشەرمەزاریی دەکردو، هیچ کات لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەمدا کە دەچوونەوە بۆ قوتابخانە کۆنەدەبوومەوە و بەبەردەوامی خۆم لێ دەشاردنەوە.

لەو تەمەنەمدا ئومێدەکانم سەبارەت بە داهاتووم هەر زوو لەناو چووبوون.

دایکایەتی کردن بۆ چوار منداڵ، خاوێن کردنەوەی ناوماڵ، ئامادەکردنی سێ چوار کەوچك چێشت بۆ سەر سفرە هەژارانەکەی ئێوارانمان، هەست کردن بەئازاری ئەو دایکە نەخۆشەی کە شەوانە بەئازاری گورچیلەوە دەینالاند، بۆ کچێکی گەنجی وەك من تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەختی ژیان بوو.

بەخراپتربوونی باری تەندروستی دایکم پارەی دکتۆرو عیلاج وای لێهاتبوو پەیدا نەدەبوو، ئەو پارە کەمەی باوکم پەیدای دەکرد، تەنانەت بەشی ئەوەشی نەدەکرد کە نانی وشکی بۆ ئێواران پێ بکڕین، دایکیشم ڕۆژ بەڕۆژ لەژێر کاریگەری نەخۆشییەکەیدا بەرەو نەمان دەچوو، منیش لەبەرامبەر ئازارەکانی ئەودا خەریك بوو تیادەچووم.

ئەو ساڵانە، ساڵانێك بوون کە ڕۆحمیان پیرکردبوو، دێوەزمەکان خەیاڵەکانمیان دەخنکاندو ئومێدەکانم پشتیان بە موعجیزە بەستبوو.

ئەو پیاوە نەفرەتیەش لەو ڕۆژە بێ چارەییەی مندا دەرکەوت، ڕێك لەو کاتەدا کە دەڵێن هەرکەس بکەوێتە ناو دەریاوە باوەش بە ماریشدا دەکات.

ئەو بەڵێندەری بیناکەی تەنیشتمان بوو، ڕێکپۆش و جوان بوو، سەیارەیەکی لوکسی لەژێردابوو و کەسێکی تەمەن مامناوەند بوو.

چاوی لەسەرم بوو، منیش بە لۆژیکی لاوێتیمەوە، ئەوم دەویست. هۆکاریش ئامادەبوو... دەمتوانی دایکە نەخۆشەکەم چارەبکەم، خوشك و براکانم بخەمەوە بەرخوێندن و کارێك بۆ باوکە بێ ئیشەکەم بدۆزمەوە.

بەحسابی خۆم فیداکاریم بۆ خێزانەکەم دەکردو بۆ ڕزگاری ئەوان خۆم بەفیدادەکرد.

باوکم لەبەرئەوەی بەدونیای خۆیەوە سەرقاڵ بوو ئاگای لە ڕووداوەکان نەبوو، بەڵام دایکم سەرەڕای نەخۆشییەکەشی هێشتاش ژنێکی زرنگ و وریا بوو.

ڕۆژێك منی لەبەرامبەر خۆیدا دانیشاندو بێ ئەوەی بمشکێنێتەوە وتی:

–من خەبەرم لەهەموو شتێك هەیە کچی خۆم، نەتتوانی بخوێنیت و ئاواتەکانت بەدیبهێنیت، حاڵ و وەزعی ماڵەکەشمان زیاتر

ئومێدەکانتیان ڕووخاند، تۆش لەلای خۆتەوە بەدوای چارەیەکدا دەگەڕێیت وانییە؟

چاوەکانم داخست، وەك چۆلەکەیەك کە لەڕاوچی هەڵهاتبێت، خەریك بوو بەرامبەر دڵم دەدۆڕام.

نەمدەویست لەوە زیاتر ڕووبەڕووی سەرنجە بێ تروسکەکانی دایکم کە هەزارەها جۆری ئاوازیان دەچڕی ببمەوەو لەوە زیاتر پەژارە بچێژم.

خوایەگیان ئەمە چ بێ ئومێدیو بێ چارەییەك بوو!

ئارەقێکی زۆرم دەردابوو وتم:

—من نیازێکی خراپم نییە دایکە.

دایکم سەری پڕ لەهەزار ئەزموونی لەقاندو وتی:

—هیچ گوناه و هەڵەیەك بەنیازی خراپەوە دەست پێ ناکات کچی خۆم، ئەوانە بەهۆی کردەوەی ناهۆشیارانەو بێ مێشکانەوە هەروەها بەهۆی پرسو ڕانەکردن بەکەسو عینادییەوە ڕوو دەدەن.

ڕێك وەك هاوسەرگیری من لەگەڵ باوکت.

خەیاڵی ڕۆشت بەرەو ساڵە پڕ حوزنەکانی ناو تونێلی زەمەن..وتی:

—دایکم زۆر لێم پاڕایەوە، هەڵەکانی خۆی وەك نموونە بۆ دەهێنامەوە..

"کچی خۆم، جوانی سك تێر ناکات، سەرەتا پێویستە ئیش و، ماڵ و ئیمکانیــات بــاش بێــت، ناتوانیــت بەخــەیاڵ کــردن بــۆ داهــاتوو دڵخۆشبیت، تەنانەت پارووە نانێکی وشکیش پـارەی دەوێـت، ئەگـەر نا لەپەیداکردنی پارەدا یـان تەندروسـتیت یـان ئیمانـت یـاخود ڕێـزت لەدەست دەدەیت.

ئای دایکی من! چەندە ڕاستت وت!

گوێم لە تـۆ نـەگرت ئـەوەتا تەندروسـتیم لەدەسـت دا لەبـەرخاتری پەیداکردنی سـێ چـوار قـران سـاڵانێکە خـۆم پشـت گـوێ خسـتووەو ئێستاش لەنێو ئەم ڕۆژە پـڕ ئازارانـەدا تەنانـەت عیبادەتەکانیشـم بـە زەحمەت جێبەجێ دەکەم، تومەس هـەموو شـتێك بەتەندروسـتییەوە بەندە.

ڕووی تێکردم بەچاوی پڕ فرمێسکەوە وتی:

– کچـی خـۆم، مـن دەزانم، هـیچ نەچـوومەتە قوتابخانــە، بــەڵام پەروەردگار بۆ جیاکردنەوەی بـاش‌و خـراپ‌و ڕاسـت‌و هەڵـە عـەقڵێکی پێ داوین، ئەو بەڵێندەرە تۆی بۆ هاوسـەرگیری هەڵنەبـژاردووە، ئـەو خێزانـدارەو منداڵیشـی هەیـە، وەك ئـەوەی هیواشـی بـۆ دەخوازیـت کۆمەکی ئێمەش ناکات، تـەنها زیـاتر تووشـی کێشـەمان دەکـات هـەر ئەوەندە.

لەشەرماندا هەموو گیانم کەوتبووە سەر ئاو، وتم:

- دایکە ئەو بەڵێنی پێدام‌و سوێندی خوارد، خانوویەکمان دەداتێ و خوشك‌و براکانم دەخاتە بەرخوێندن، چارەسەری تۆش دەکات، باوکیشم چیتر لەبەفرو باراندا بەدوای کاردا ناگەڕێت.

سەرەڕای قسەکانم بەسۆزەوە وەك منداڵ لەباوەشی گرتم‌و وتی:

- کچە نیەت باشەکەی من، تۆش باوەڕت بەهەموو ئەمانە کرد وانییە؟ تۆ خۆت نازانیت، ئەگەر پیاوێکی تەمەن گەورەو دەوڵەمەند کچێکی جوانی هەژاری بوێت، ئەوا بۆ ئەوە نایەوێت بیکاتە کابانی ماڵەکەی، ئەو تەنها دەیەوێت بیکاتە مەزەی گوناهەکانی‌و دواتر لەگۆشەیەکدا فڕێی بدات.

بێ چارە دایکم لەبەرئەوەی بیروباوەڕەکانی لەمێشکمدا بچەسپێنێت، نموونەی زۆری هێنایەوە عەقڵم حەقی بەدایکم دەدا، بەڵام هەستەکانم پێیان وتم: "نەخێر"

لەناو حاڵێکی ئاڵۆزدا بووم، لەبەرئەوەی نەمخوێندبوو، لەناو هاوڕێکانمدا هەستم بەوە دەکرد کە من کەسێکی پلە دووم، دەموت ئەگەر شوو بەم پیاوە بکەم دەوڵەمەند دەبم‌و دەتوانم وەك ژنێکی بەهێز بگەڕێم.

لەکۆتاییدا ڕووداوەکان ڕوویاندا.

گەورەترین هەڵەی ژیانم ئەنجامدا.

شەوێك، ئەو دایکەی کە لەتاو ئازار دەیناڵاندو خوشكو براکانم کە لەتەنیشت یەکەوە پەپوولە ئاسا خەویان لێ کەوتبوو و، ئەو باوکەی کە لەبەر ماندوێتی ئیشەکەی ئاگای لەخۆی نەبوو، منیش لەگەڵ بێ چارەییەکانیاندا بەجێم هێشتنو لەگەڵ بەڵێندەرەکەدا هەڵهاتم.

ئەویش بەئەزموونی پازدە ساڵیمەوە.

ئەو هاوسەرگیرییەی کە تەمەنێك خەیاڵم بۆ دەکردەوە تەنها هەفتەیەکی خایاند.

بەیانیەك کاتێك خەبەرم بوویەوە بینیم لەژووری ئوتێلەکەدا دیار نەماوە، لەکاربەدەستێکی ئوتێلەکەوە زانیم کە ڕۆیشتووە خزمەتکارێکی لە ئوتێلەکەدا بۆ گرتبووم و چووبووە لیستی ونبووەکانەوە.

ئەو ڕۆژە، ئەو ڕۆژەبوو کە قسەکانی دایکم کە بەپاڕانەوەوە دەیکردن وەك تەقینەوەی بۆمبێك مێشکمی پارچە پارچە دەکرد.

ئەو ڕۆژە، زەمەنێك بوو کە هەموو خەیاڵەکانم لەبەردەم گێژەڵوکەکاندا وەك کا بەباداچوون.

ئەو ڕۆژە، ئەو ڕۆژەبوو کە تێگەیشتم ناتوانم بەم شەرمەزاریەوە بگەڕێمەوە ماڵەوەو لەناخو دڵمەوە ئاواتی مەرگم دەخواست. ئەوانەی ئەم چیرۆکەم دەخوێننەوە بەدڵنیاییەوە چیرۆکەکە بۆیان ئاشنایە چونکە کاتێك هەڵەکان وەك یەك دەبن، ئەنجامەکانیش ناگۆڕێن.

هیچ نەمابەسەرمدا نەیەت، دواجاریش یەکێك لەگورچیلەکانم دایە مافیایەکی گورچیلە، دوای سێ چوار مانگ هەواڵی وەفاتی دایکم پێگەیشت، بیستم لەکاتی مردنیدا لەناو هاوارو ناڵەدا ناوی منی هێناوە خوشكو براکانمیان داوەتە خانەی بێ نەوایان، باوکیشم لەئەنجامی جگەرەکێشان کە ساڵانێك بوو، وەك هاوڕێیەك پشتی پێ دەبەست تووشی شێرپەنجەی سییەکان هاتووە.

ئێستا من دەستگیرانی پیریم، لەنەخۆشخانەچاوەڕێی چاك بوونەوە دەکەم.

کاتێك کە چاك دەبمەوە چی ڕوودەدات؟ لەڕاستیدا ئەوە ڕۆحمە کە پێویستی بەچاکبوونەوە هەیە، ئازارەکەی ناخم کە بڵێسە دەدات پێویستی بەچاکبوونەوەهەیە...

ئەگەر چاوەڕێی هاوسەرگیرییەکی ئابڕومەندانەم بکردایە، لەکۆتا ساتەکاندا لەگەڵ دایکمدا بمایامەوەو خوشكو براکام جێ نەهێشتایە، پارووەنانێکی وشکم بخواردایە بەڕوو سوورییەوە دووبارە خەیاڵە ئەستەمەکانم هەڵبچنیایەتەوە...

ئاە خۆزگە!

بۆ کچێکی بەدبەخت کە ئەوانی لەسەختترین ساتەکانیاندا جێ هێشت باوکم دەڵێت: "من کچێکی وەهام نییە" خوشكو براکانیشم ناوی من هیچ ناهێنن.

بەڵام ئەو دایکە بەسۆزەم تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا هەرناوی منی هێناوەو وتویەتی: "من لەو خۆش بووم، خوداش لێی خۆشبێت"

ئای دایەگیان! تۆ منت بەخشی، بەڵام من هیچ کات خۆم نابەخشم. پەروەردگارم وەها لێپرسینەوەیەکی لێکردم، تۆڵەی دایکێکی بێ گورچیلەی بەو شێوەیە لێکردمەوە، بەشێوەیەك کە گورچیلەکانم دایە دەست قەصابە بێ ویژدانەکان.

ئای خوایە من چی بکەم ئێستا؟ بۆکوێ بڕۆم؟ منێك لەئەنجامی ئەو هەڵەیەی کە لەلاوێتیمدا کردم لەدەرگای کێ بدەم؟

کام مرۆڤی نیەت باش لەدەرگای کچێك دەدات کە هەموو شتێکی لەنێو بێ ویژدانیەکانی دونیادا لەدەست داوە؟! جگە لەو کەسانەی کە پێیان وایە دەتوانن بەپارە هەموو شتێك بکڕن، کێی تر سەیری ڕووخساری من دەکات؟

من کەسێکم کە لەسەختترین ساتەکانی ژیانمدا خێزانەکەم جێ هێشتو خیانەتم لێ کردن، هیچ کەس هێندەی من باجی ئەو گوناهە بێ شومارانەی ناداتەوە!

نازانم! ئایا پەروەردگار دەرگای خۆی دەکاتەوە بۆ بەندەیەك کە خەریکە لەژێر باری گوناهەکانیدا تیادەچێت!

من تەواو بووم، من بکوژن، لەوە زیاتر حەقی ژیانم نییە!

تکایە گەنجینە! ئەی ئەوانەی گوێتان لێمە! ئەوانەی چیرۆکی ژیانم دەخوێننەوە! تکایە بۆ ساتێکیش بێت گوێم لێبگرن.

تەنانەت خراپترین دایك‌و باوکیش، لەباشترین بێگانە دڵسۆزترو متمانە پێ کراوترن.

تکایە بڕیارەکانتان لەگەڵ خێزانەکانتاندا بدەن، بەوان مەڵێن نەزان. ئەوان زاناکانی قوتابخانەی ژیانن.

لەبێ چارەییەکانی من بڕوانن‌و پەند وەربگرن، باهەڵەکانی من ڕێی ڕاست نیشانی ئێوە بدات.

پێش ئەوەی مافیاکان وەك بەلا گورچیلەکەی تریشم لێ بسێنن‌و وەك پارچە گۆشتێك لەوناوە فڕێم بدەن، تکایە دوعام بۆ بکەن، لەبەرخاتری من دەستەکانتان بۆ ئاسمان بەرز بکەنەوە.

ئێستاکە لەکوچەیەکی نەخۆشخانەدا کچێکی تاوانبار دەناڵێنێت.

تکایە با ئەم وەسێتنامەیەم بۆ ئێوە ببێتە پەندێك.

(ناوەکەی پارێزراوە)



# ئازایەتیش بەو شێوەیە؟!

لەچاوەکانی موستەفا پاشای سەرۆك عەشیرەتی میران کە جەزیرەی هەژاندبوو، بروسکەی سەرسوڕمان و پەشۆکاوی دەردەچوو.

سەرنجەکانی بڕیبوویە سەعیدی بەناوبانگ کە لەبەردەمیدا هەڵنەستایە سەرپێ.

موستەفا پاشا، پێشەنگی بێویژدانی دەوروبەری، لەتەمەنیدا ئەوە یەکەمجاری بوو، ڕووبەڕووی دیمەنێکی وەها ببێتەوە.

ئەو گەنجە کێ بوو؟ بۆچی لەکاتێکدا هەمووان بەحورمەتەوە هەستاونەتە سەرپێ و ملیان کەچ کردووە، کەچی ئەم گەنجە هیچ خۆی تێك نەداوە و ئەمی بەهەند وەرنەگرتووە؟!

دەبێت هۆکارێکی زۆر گرنگ لەپشت ئەمەوەبێت!

بەڵێ، ئەمە هۆکارێکی گرنگی لەپشتەوە بوو.

سەعیدی گەنج کە خۆی بۆ عیلمو ئیمان نەزرکردبوو، لەخەونیدا عەبدولقادری گەیلانی دیتبوو، فەرمانێکی سەیری لێ وەرگرتبوو، ئەوە لەکاتێکدا کە عەبدولقادر هاوکارییەکی مەعنەوی زۆری کردبوو، پێی وتبوو:

–لە جەزیرە، سەرۆك عەشیرەتی میران "موستەفا پاشا" زوڵم لەخەڵکی دەکات، بڕۆ ئەو بۆ ڕێی ڕاست بانگهێشت بکە.

سەعیدی گەنج کە چێژێکی تایبەتی لە جەنگ لە دژی ناحەقی دەبینی، لەبەرامبەر ئەم فەرمانەدا بێ ئەوەی بیر لەمەترسیەکانی بکاتەوە، یەکسەر کەوتبووەڕێ...

تەنها بیرۆکەی ئەو بریتی بوو لەڕووبەڕووبوونەوەی ئەو موستەفا پاشایەی کە ئەو ناوەی هەژاندبوو.

سەعید گەیشتە شارۆچکەی سەربەشاری ماردینو چادرە شۆخو شەنگەکەی موستەفا پاشای سەرۆك عەشیرەتی دۆزییەوە کە دەوروبەرەکەی بەدەست زوڵمی ئەوەوە دەیانناڵاند.

دوای کەمێك موستەفا پاشای سەرۆك عەشیرەتیش گەیشت لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەوانەی کە لەناو چادرەکەدا بوون هەستانە سەرپێو

ملیان کەچ کرد، بەڵام سەعیدی بەناوبانگ تەنانەت لەجێی خۆیشی جووڵەی نەکرد، بێگومان ئەم حاڵەتە موستەفا پاشای زۆر تووڕەکرد.

هەڵنەستان لەبەرئەو موستەفا پاشایەی کە هەمووان بەڕێزەوە سەریان بۆ دادەنەواند، مەترسییەك بوو کە شایەنی بەهەند وەرگرتن بوو.

چۆنئەم گەنجە کە هەڵناستێتە سەرپێ؟ ئەوە ئیهانەیەکی ڕوون‌و ئاشکرابوو، هیچ کات شایەنی لێخۆشبوون نەبوو.

موستەفا پاشا کە لەپەستی و پەشۆکاویدا نەیدەزانی چی بکات، لەکاپتن فەتتاحی تەنیشتی پرسیی:

—ئەم گەنجە کێیە؟

—ئەمە، مەلاسەعیدی بەناوبانگە کە ناوبانگی بەهەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە.

ئەمە ئەو کەسەیە کە مەلا (فتح الله) نازناوی "بەدیعوزەمانی" پێ بەخشیووە.

موستەفا پاشا هیچ کات لەگەڵ زاناو مەلاکاندا هەڵی نەدەکرد، هەموو کات غیرەی لە بەرزی مەعنەوی ئەوان دەکرد.

موستەفا پاشا سەرنجە پڕ قینەکانی کە ئاگریان لێ دەبوویەوە بڕییە چاوە پڕ ئازایەتی‌و پڕشنگەکانی سەعیدی بەناوبانگەوەو پرسی:

-بۆچی هاتویت بۆئێره؟

سەعیدی بەناوبانگ لەوشوێنەوەی کە دانیشتبوو پەنجەکانی بۆ پێشەوە ڕاکێشاو بەدەنگێکی گڕەوە وتی:

-هاتووم تا تۆ بهێنمە سەر ڕێی ڕاست یان واز لەو زوڵمو زۆرە دەهێنیت کە بەرامبەر خەڵکی دەیکەیتو دەست بە نوێژ کردن دەکەیت؟ یاخود من تۆ دەکوژم!

ئەم قسەیە وەك بۆمبێك لەچادرەکەدا تەقییەوە، موستەفا پاشا یەکەمجاری بوو ڕووبەڕووی کەسێك ببێتەوە کە بەوچەشنە بوێر بێت، ئەوانەی ناو چادرەکەش لەپەشۆکاویدا نەیان دەزانی چی بکەن.

پاشا لەڕقدا بەپەلە چووە دەرەوەی چادرەکە، دوای ئەوەی کەمێك تووڕەییەکەی ڕەوییەوە گەڕایەوە ناو چادرەکەو وتی:

-کەواتە من دەکوژیت وانییە!

-ئەگەر واز لەو زوڵمە نەهێنیت، بەڵێ...

پاشا چاوی بڕییە شمشێرەکەی سەعید کە هەڵی واسیبوو بە کۆڵەکەی چادرەکەدا...

-بەتەمای بەم شمشێرە بمکوژیت؟

سەعید بەردەوام بوو لەهەڵسوکەوتە بێ باکو بوێرانەکانی:

-شمشێر نایبڕێت، بەڵکو دەست دەیبڕێت!

پاشا بۆماوەیەك بیری کردەوە لەوەی چی بڵێتو چی بکات وتی:

–باشه، من ئەوە دەکەم کە تۆ دەیڵێیت، بەڵام مەرجێکم هەیە؟

سەعید پرسیاری کرد:

–مەرجەکەت چییە؟

–من لێرە لە جەزیرە، کۆمەڵێك زانای زۆرم هەیە، ئەگەر بتوانیت ئەوان لە مشتومڕێکی زانستیدا ببەزێنیت ئەوا باشە... ئەگەر نا فڕێت دەدەمە ڕووباری فوڕاتەوە.

سەعید نیازی سەردانەواندنی نەبوو، وتی:

–پاشا، هەروەك چۆن حەددم نییە ئەو زانایانە ببەزێنم، تۆش حەددت نییە من فڕێ بدەیتە ناو ئاوی فوڕاتەوە، سەرەڕای ئەمانەش داواکارییەکەت قبووڵ دەکەم، بەڵام منیش داواکارییەکم لەتۆ هەیە، ئەگەر ئەو زانایانە ببەزێنم من داوای تفەنگێکت لێ دەکەم.

–تۆ زانایت، تفەنگت بۆ چییە؟

–بۆ ئەوەی ئەگەر لەسەر پەیمان نەمایت، بەو تفەنگە بتکوژم..

هەردوولا ڕێکەوتن.

هەر لەوێدا بۆ کۆبوونەوەیان لەگەڵ زاناکاندا ڕۆژێکیان دیاری کرد.

هەموران بەشەوقەوە چاوەڕێی ڕۆژی مشتومڕەکەیان دەکرد، هەر ئەو کاتە دەیانزانی کە ئەو ڕۆژە دەچێتە مێژووەوە. ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوەکە، خەڵکێکی زۆر بۆ تەماشاکردنی ئەو دیمەنە

سەرنجڕاکێشـە کۆبورنـەوە، هـەمووان هەناسـەیان لـەخۆیان بڕیـور مەراقی دوو شتیان دەکرد.

—ئایـا سـەعیدی بـەناوبانگ دەتوانێـت، ئـەو زانـا بەناوبانگانـە ببـەزێنێت؟ ئەگـەر نـەتوانێت، موسـتەفا پاشـای بـێ ویـژدان ئـەوی دەکوشتو فڕێی بداتە ناو ڕووبارەوە؟

زاناکـانی موسـتەفا پاشـا بەکتێبـەکانی دەسـتیانەوە دەوری سـەعیدیان دابـوو، بـەکورتی دەسـتیان کـرد بـە ئاڕاسـتەکردنی ئـەو پرسیارانەی کە ئامادەیان کردبوو.

هـەموو چـاوەکان لەسـەر سـەعید بـوون کـە وەك قوربانیـەك لەناوەڕاستدا دانیشتبوو، ئەو سەعیدەی کە موستەفا پاشا بەسەرنجە پڕ لە قینەکانیەوە لێی دەڕوانی تابلێی ئارامو دڵنیابوو.

بەداخەوە کە لەسەرەتادا وادیاربوو هەموو شتەکان لە دژی سەعید بوون، لەبەرئەوەش خەڵکەکەی دەوروبەری تا بڵێـی سـەغڵەت بـوون، بـەڵام کاتێـك سـەعیدی بـەناوبانگ دەسـتی کـرد بـە وەڵامدانـەوەی پرسـیارە هەڵبـژێردراوە قورسـەکان، پەشـۆکاوی و خـەمی خەڵکەکـە کۆڕا.

چونکە وەڵامـەکانی ئەوەنـدە جـوانو موقنیـع بـوون، بەشـێوەیەك تەنانەت زاناکـانیش دەمیـان داچـەقیبوو و سـەریان لـە وتـەکانی ئـەو گەنجە سوڕمابوو.

سەعیدی بەناوبانگ وەك شتێك بەشیکردنەوەو ڕوونکردەوەکانی ئامادەبوانی تووشی سەرسوڕمان کردبوو، بەشێوەیەك لەگەڵ چایەکەی خۆیدا چای هەندێك لەزاناکانیشی خواردبوویەوە، بەڵام هەستیان پێ نەکردبوو ئەوەندە پەشۆکابوون.

لەبەردەم ئەم دیمەنەدا موستەفا پاشا نەیتوانیبوو لەوە زیاتر بەرگە بگرێت بۆیە هەستابوویە سەرپێ‌و وتبووی:

—بەڕێزان، هیچ کام لەئێوە ناتوانێت بەرامبەر سەعید بوەستێت ئەوە ئاشکرایە، پێش ئەوەی ئەم پێشبڕکێی زانیارییە دەست پێ بکات ئاشکرایە کە دۆڕاندوتانە، ئەو بەشێوەیەك کاری تێ کردوون کە تەنانەت ئاگاتان لێ نییە کە چایەکانی بەردەمتانی خواردووەتەوە.

زاناکانی جەزیرە نزیکەی چل پرسیاریان ئاڕاستەی سەعیدی بەناوبانگ کرد، بەڵام ئەو وەڵامانەی کەوەریان دەگرت بەمەعنای کەلیمە بێ وێنە بوون، سەعید ئەوانی لەسەر خوانێکی زانیاری کۆکردبوویەوە.

زاناکان ئەوەندە بەسەعید سەرسام بوون کە بێ ئاگابوون لەوەی سەعید وەڵامی یەکێك لەپرسیارەکانی بۆ تاقی کردنەوەی ئەوان بەهەڵە داوەتەوە. سەعید لەکۆتایی گفتوگۆکەدا ئەوەشی ڕوون کردەوە وتبووی: بەڕێزان، من وەڵامی پرسیارێکم بەهەڵە دایەوە، ئێوە هەستتان پێ نەکرد بەڵام من ئێستا ڕاستەکەیتان پێ دەڵێم.

زاناکان لەو زەبرەی کۆتاییدا بەتەواوی کزبوون، نەیان توانیبوو خۆیان بگرن لەوتنی:

-شەرمەزارت کردین.

هەندێك لەو زانایانە دووبارە هاتبوونەوە بۆلای سەعیدو لەلای ئەو وانەیان وەرگرتبوو.

لەدوای ئەو ئەنجامەوە ئەو موستەفا پاشایەی کە لە جەزیرەدا ناوی بە خراپەکار دەرکردبوو چیتر هیچی لەدەست نەدەهات... چونکە لەبەرامبەریدا گەنجێك ڕاوەستابوو کە بەهیچ جۆرێك نیازی پاشەکشەی نەبوو.موستەفا پاشا بەبێ چارەییەوە لەسەر پەیمانی خۆی مایەوە، هەم تفەنگەکەی پێ دا، هەمیش دەستی بەنوێژکردن کرد، بەڵێنیشی دا کە چیتر زوڵم لەخەڵك نەکات.

لەبەرامبەر ئەم ئەنجامەدا لەمێشکی هەموو ئەوانەی کە بۆ سەیری گفتوگۆکە هاتبوونو لەسەرو هەمووشیانەوە موستەفا پاشا کە بەخراپەکاری ناوبانگی دەرکردبوو، ئەم شتە چەسپابوو:

"ئەو مرۆڤە نیاز باشانەی کە تەنها پشت بە خودا دەبەستن بەدڵنیاییەوە سەردەکەونو، ئەوانەشی پشت بەخراپەکاری دەبەستن درەنگ یان زوو هەمووشتێك لەدەست دەدەن"

ئەم چیرۆکە ڕاستەقینەیە دەبێتە وەسیەتێك بۆ هەموو ئەوانەی خراپەکاری دەکەن.



# بەبێ شەرم، هەڵخەڵەتاموو
## هەموو شتێکم لەدەست دا

نازانم ئەو کەسانەی کە ئەم چیرۆکەم دەخوێننەوە چیم پێ دەڵێن؟ بێ عەقڵ! سادە! نابینا! لەهیچ شتێك تێ نەگەیشتوو! گێژ! و چەندەها قسەی تریش.....

هەرچییەك بوترێت کەمە...

بێگومان ناسینی مرۆڤەکان، خوێندنەوەی نیازەکانیان و دەرکردنی حوکم لە هەڵسوکەوتەکانیانەوە گەورەترین هونەرە.

بەخۆڕایی نەیان وتووە: "ئەوانەی خوێندنەوە بۆ ژیان دەکەن، مرۆڤەکان دەناسن لەنیوەی ڕێگاپەکیان ناکەوێت"

بەهۆی کەم توانایی و نەشارەزاییمەوە لەو بوارەدا هیچ شتێك نەما بەسەرمدا نەیەت.

چۆن؟

لەکۆتا پۆلی ئامادەیی بووم، کچێکی مولتەزیم بووم، ئەو پەروەردەو کلتوورەی کە لەخێزانەکەمەوە وەرم گرتبوو هیچ پەیوەندییەکی بەعیشقو دڵدارییەوە نەبوو و لەگەڵ هەمواندا بەنیەت باشییەوە هەڵسوکەوتم دەکرد.

لەبەرئەوەی لەدونیادا فرتو فێڵە شەیتانیەکان هەمیشە بە ماسکەوە دەسوڕانەوە، باوەڕم بەهەمووان دەکرد.

لەبەر ئەم هۆیەش باوکمو دایکم، هەروەها دۆستە هۆشیارەکانم چەندین جار منیان ئاگادار کردەوە.

"پێش ئەوەی مرۆڤەکان بناسیت باوەڕ بە هەموو قسەیەکیان مەکە! یەکسەر بە هەموو قسەیەکی شیرین مەخرۆشێ، هەرکەسێك کە دێتە ڕێت وامەزانە حەزرەتی (خضر)ە، بەدوایدا بگەڕێ، پرسیار بکە ئەوجا بڕیاربدە.."

هەموو ئەمانە شتانێکی جوان بوون، بەڵام لەبەرئەوەی لەمێشكو ناخمدا هیچ نیازێکی ترم نەبوو، هەموانم وەك خۆم بەنیاز باش دەهاتە پێش چاو.

بەڵێ، ئەکرەم لەیەکێك لەو ڕۆژانەدا دەرکەوت، من لەکوێ بمزانیایە ئەو کەسێکی فێڵبازو هەڵخەڵەتێنەرە؟ لەوەڵامی ئەوانەشدا کە ئاگریان دەکردەوە دەموت: "من هیچ خراپەیەکم لەو نەدیوە"

ئەکرەم ڕێك بەو زوبانە قسەی دەکرد کە من دەمویست لەبەرئەوەی من کچێکی دیندار بووم، لەگفتوگۆکانماندا ئایەت و فەرموودەی ڕیز دەکردو نموونەی لەقورئان دەهێنایەوە.

منیش بەو باوەڕەی کە ئەکرەم چەندە مرۆڤێکی باشە پاساوم بۆ خۆم دەهێنایەوە.

لەدوای یەکەم گفتوگۆمان، بەهۆی ئەوەی من ڕازی نەبووم بەرەوڕوو یەك ببینین، بەتەلەفون گفتوگۆمان دەکرد، بێ هەواڵ لەوەی ئەم هەڵەیە سەر بۆ هەڵەیەکی گەورەتر دەکێشێت.

مامۆستای مێژووم منی بردە پەناگەیەك و وتی:

-من چاودێری تۆ دەکەم، دەبینم لەگەڵ کوڕی بێگانەدا بە تەلەفون قسە دەکەیت، قسەکردن لەگەڵ کوڕی بێگانەدا کارێکی ڕاست نییە، ئەگەر هەستەکانت بخەیتەڕوو، ڕات دەکێشێت بۆ ڕێگایەك کە هیچ چاوەڕوانت نەکردووە، دواتریش خۆت لەڕێی حەرام و هەڵەدا دەبینیتەوە.

کاتێك ئەمەم بەئەکرەم وت، توانی بەم قسانەی ڕازیم بکات:

-بەتەلەفون هیچ نابێت! خۆ دەستمان نەخستۆتە دەستی یەك و چاومان لەچاوی یەك بڕیبێت! تەنها گوێمان لەدەنگی یەکە.

بەدرێژەکێشانی تەلەفونەکان، داوای یەکتر بینینی کرد، کاتێکیش من ویستم ڕازی نەبم وتی:

-ئێمە دەمانەوێت هاوسەرگیری بکەین.. بۆ ئەوەی یەکتر ببینین‌و یەکتر بناسین چۆن دەبێت؟ بەشێوەیەکی زۆر ڕێ پێدراو کۆدەبینەوەو قسە دەکەین، تەنانەت ئەگەر حەز دەکەیت هاوڕێیەکیشت لەگەڵ خۆت بهێنە، ئەگەر متمانە بەمن ناکەیت کەسێك لەگەڵ خۆت بهێنە.

لەکاتێکدا مرۆڤ نیەتی باش بێت قابیلە چی ڕوودەدات؟

دووبارە بەو قسانەی پاشقولی لەمێشکم گرتەوە.

بەو مێشکە بچوکەمەوە نەمتوانی لەوە تێبگەم کە ئەو خەریك بوو پەیڕەویی دووەم هەنگاوی پلانەکەی دەکرد.

بەبەشداری هاوڕێیەکم چوار پێنج جار کۆبووینەوەو قسەمان کرد، بەڵام ئەکرەم بەوەشەوە نەوەستاو دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی هەنگاوی سێیەم، وتی:

-بڕوانە! کاتێك کەسێکی ترمان لەگەڵدا بێت، وەك دوو بێگانە ناچار دەبین قسە لەسەر ئەم‌و ئەو بکەین، ئێمە پێویستە بەتەنیا بین تا پێکەوە بتوانین باس لەشتەگرنگەکان بکەین سەبارەت بەژیانی داهاتوومان.

لەسەرەتادا ئەم داوایە زۆر بەریئانە هاتە پێش چاوم‌و بەباوەڕکردن بەنیاز باشی ئەکرەم ڕازی بووم چەند جارێکیش بەتەنیا کۆببینەوە.

بەڵام پیلانەکانی ئەکرەم بەمەشەوە نەوەستان، ئەو خستبوویە مێشکی خۆیەوە کە کچێکی وەك من دیندارو بەڕەوشتو بە "جوان" ناسراو لەدەوروبەریدا بکاتە نێچیری نیازە خراپەکانی.

کاتێك زانی من پەرچەکردارم سەبارەت بەم جۆرە یەك بینین و خەڵوەتە هەیە، ئەویش لەبەرئەوەی هەندێك لەهاوڕێکانم ئاگاداریان دەکردمەوە، ئەو وتی:

–تۆ ڕاست دەکەیت، من ئەوەم پێ خۆش نییە، ئێمە پێکەوە خەریکین گوناه ئەنجام دەدەین، لەڕاستیدا ئەمە ڕێگایەکی ئاسانتری هەیە.

وتم: ئەو ڕێگایە چییە؟

– با هاوسەرگیری بکەین، ئەو کاتە بەیەك حەرام نابین و، هەم گوناهیشمان ناگات، هەروەها دەتوانین یەکتر ببینین، دەتوانین سەبارەت بە داهاتوومان زیاتر قسە دەربارەی وردەکارییەکان بکەین‌و زیاتر یەکتری بناسین.

کاتێك بابەتی ئەو نیکاحە لەمێشکمدا جێگیر نەدەبوو، پرسیارم لەمامۆستایەکم کرد کە متمانەم بەزانستەکەی هەبوو.

–هیچ شتێك نییە وات لێ بکات نیکاح بکەیت! بەهیچ شێوەیەك شتی وانەکەیت! شتێکی واش نەبووە تا ناچار بەنیکاحت بکات، پێش هەموو شتێك خێزانەکەت ئاگایان لەم بابەتە نییەو ڕووخسەتی ئەوانت

بەدەست نەهێناوە، تەنانەت مەرجە کۆمەڵایەتییەکانیش بۆئێوە دەستەبەرنین، خوێندتان تەواو نەکردووەو خاوەن ئیش نین.

هەرکەسێك پێش ئەوەی توانای ماددی باش ببێتو ڕوخسەتی خێزانەکەی وەربگرێت، هاوسەرگیری کردنەکەی تەنها بەڵاو دەردەسەری بۆ دەهێنێت، چونکە یەکێك لەمەرجەکانی ژیانی بەختەوەر هاوکاری دایكو باوكو ئابوورییەکی پێویستە.

ئەگەر ئەمانە بوونیان نەبێت، ئەوا ئێوە بۆیە ئەم کارە دەکەن تا لەژێر بەپرسیاریەتیەکانی نیکاحدا خۆتان قوتار بکەن، کەواتە لەکۆتاییدا ئێوە بەچی دەگەن؟ تۆ ئەوە دەزانیت؟

مامۆستاکەم ڕاستی دەکرد، ئەگەر قەدەغەکراوەکانی دین لەنێوان دووگەنجدا نەما دەهاتە پێش چاوم کە کۆتایی ئەم ڕێ یە بەرەوە کوێ دەڕوات. سەرەڕای بەرگری کردنم بەڵام ئەکرەم بەهێزی زیرەکیو یارییە مەنیقیەکانیەوە ڕازی کردم کە هاوسەرگیری بکەین.

ئیتر تاقیکردنەوەیەکی گەورە دەستی پێ کرد بۆ دوو گەنج کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری هەستەبێ کۆنترۆڵەکانیانەوە.

دواتر چی ڕوویدا؟

ئەو ماڵە باجێنەیەی کە کۆتاییەکەی هەر لەسەرەتاوە دیاربوو، بەنەگبەتی کۆتایی هات. من وەك کچێك کە هەموو هەستە پاکەکانم لەدەست داوە ئەوە ماوەی دووساڵە ناتوانم لەسەر جێگەهەستم.

دونیـام هـەموو تێکچـوو و خەونـەکانم بوونـە خۆڵـەمێش، هـەموو داهاتوو و چاوەڕوانیو ئومێدەکانم وەك ئەژدیهایەك قووتیان دام.

باوکم وەك کەسێك کە کچە پاکەکەی چیتر پیس بووبوو، نەیتوانی بەرگە بگرێت، تووشی خوێن بەربوونی مێشك هاتو بەهۆیەوە شـەلەل لێی دا...

ئەی دایکم؟ ئەو لەمن خراپترە، هۆشی لەدەست داوەو ژیانی بۆتـە دۆزەخ، کۆتایی ئەو سەرکەشییەی کە بەخەونەپاکەکانی کچێکی گەنج دەستیان پێ کرد، بوویە کۆتایی ژیانو خۆشبەختیش.

ئەی گەنجینە!

من وەك کەسێك کـە ژیـانی بەخـەمو ئـازارەوە بەسـەربردووە ئـەم ڕستانەم بۆ ئێوە نووسیوە...

ڕەنگە سبەی تەمەنم کۆتایی پـێ بێـت! بـەڵام تکایـە بـا مـن ببمـە نموونەیـەك بۆئێـوەو لەوسـایەیەدا ببمـە وەسـیلەی کـارێکی خێـرو بەوشێوەیە دونیا بەجێ بهێڵم.

تکایە لەدوای خوێندنەوەی چیرۆکەکەم بەم شێوەیە بیربکەنەوە:

"گۆزەی ئاو، لەڕێی کانیدا دەشکێت."

تکایە ئەم وەسیەتەم لەبیر مەکەن.

(ناوەکەی خوازراوە)



# یادگارییەکی ئاگر ئاسا

بگات بەدەستی زۆر بەڕێز مامۆستا خالید،

مـن وەك ئافرەتێـك کـە زۆربـەی کتێبـەکانتانم خوێندووەتـەوە، بـە پاکترین دوعاکانمەوە سلاوتان بۆ دەنێرمو هیوای تەمەن درێژیتان بـۆ دەخوازم.

ئێستاکە من بەشەوقو زەوقو دڵێکی تایبەتیەوە چوومەتە دونیـای خەیاڵـەوە، ئـەم ڕستانەتان بەفرمێسکەوە بـۆ دەهۆنمـەوە، دڵـم زۆر پڕەو زۆر شتم هەیە کەبۆتانی باس بکەم.

لەو دونیای تاقیکردنەوەیەدا چی بەسـەر مرۆڤدا نایـەت؟ هـەموو مرۆڤێك چیرۆکێکی تایبەت بەخۆیو تاقیکردنەوەیەکی سـەختی هەیـە

که ڕەنگە بەهۆیەوە زۆری بۆ هاتبێت و هەندێك جاریش بەربەستگەلێك هاتوونەتە سەر ڕێی کە بوونەتە هۆکاری کەوتن و شکستهێنانی.

ژیانی منیش پڕە لە ئەزموونگەلێك کەلە عەشقەوە بۆحەق و لەخەیاڵەوە بۆڕاستی درێژبوونەتەوە.

کە ویستم لەگەڵ ئێوەی بەڕێزدا بەشی بکەم، لەبەرئەوەی کتێبەکانی ئێوە پڕە لەهاوشێوەی ئەم چیرۆك و بەسەرهاتانە، ویستم سەرباری ئەو هەموو ئەزموونی ژیانەی کە لاتانە منیش کەمێك خوێ زیاد بکەم بۆ سەر سفرەکەتان.

من بەقووڵی عاشقی هاوپۆلێکم بووم بەناوی ئێرجان کە پێکەوە کۆلێژی پەروەردەمان دەخوێندو پێکەوە تەواومان کرد، ئەو هیچ گوێی بە پەیوەندی خۆشەویستی و شتی لەوجۆرەوە نەدەدا.

زۆر ڕاستگۆو زانستپەروەر بوو حەزی بەگیانی هاوکاری بوو. ماوەی سێ ساڵ هەرچیم لەدەست هات کردم بۆ ئەوەی هەست بەو خۆشەویستییەی من بکات، بەڵام ئەو پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی کە خۆی گێل بکات.

ئێمە گەیشتبووینە کۆتا ساڵمان و منیش دەمویست چیتر بەئاشکرا سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵی بدوێم.

من پێم وابوو هۆکاری دەرنەبڕینی هەستی بۆمن یاخود نەبوونی کاردانەوەی بۆ هەڵسوکەوتەکانی من بەهۆی جیاوازی کلتووری و

ناوچەییەوەبوو، لەبەر ئەمەبوو بەنیاز بووم وردەکارییەکان لەخۆی بپرسمو دان بەخۆشەویستییەکەمدا بنێم..

چەند جار پێم وت: "دەمەوێت سەبارەت بە بابەتێکی گرنگ قسەت لەگەڵدا بکەم" لەهیچ کام لەجارەکاندا نەیوت: "نامەوێت قسەت لەگەڵ بکەم" بەلآم هەموو کات بەبەهانە هێنانەوە خۆی دەدزییەوە لێم.

چەند جارێکی تریش هەوڵمدا، بەلآم نەکرا، ئەو یان خۆی لە داواکەم دەدزییەوە یاخود ئەندێشەی ئەوەی هەبوو کە ڕەنگە بەهۆی تێڕوانینی جیاوازمانەوە بۆژیان "کێشە دروست ببێت".

لەگەڵ ئەوەشدا من کچێك بووم لەلایەن دەوروبەرمەوە زوو هەستم پێ دەکرا. لەگەڵ ئەوەی چەندین کوڕ دەیانویست لەگەڵمدا قسە بکەن، بەلآم من هەموویانم ڕەتدەکردەوە. لەناو ئەوانەدا هاوشانی خۆشمیان تیابوو، ئێمە خاوەن کلتوورو بیروڕاو تێڕوانینێکی جیاواز بووین بۆ ژیان. مرۆڤەکانی کۆمەڵەی ئێمە نەکچیان بەکەسی جگە لەخۆیان دەداو نە کچیشیان دەرەوەی خۆیان دەخواست، هەر کەسێکیش لەو کلتووره دەربچووبایە زۆرینەی کات باجەکەی بەگیانی خۆی دەدا، بەلآم بەهۆی خۆشەویستیمەوە بۆ ئەو، هەموو ئەو شتانەم فەرامۆش کردبوو. لەکۆتاییدا توانیم بەڵێنێك لە ئێرجان

وەریگرم، کاتو شوێنێکمان پێکەوە دیاری کرد، بڕیاربوو لەوێ یەکتر ببینینو قسە بکەین.

بەلام ئێرجان مەرجێکی هەبوو:

-من بەهۆی دینەکەمەوە، ناتوانم لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەمدا بەتەنیابم، تکایە باکچێکت لەگەڵدا بێت، هەرکچێك کە خۆت دەتەوێت.

ویستم بەرپەرچی بدەمەوە، بەلام لەپێناو ئەو خۆشەویستییەمدا بۆی بێ دەنگ بووم و ڕازی بووم، هاوڕێیەکم لەگەڵ خۆم بردو ڕۆیشتین بەرەو شوێنی یەکتر بینینەکە.

من خەریك بوو دەتوامەوەو بەهەزار دەردەسەری دەستم کرد بە باسکردنی هەستەکانم کە ئێرجان قسەکانی پێ بڕیمو وتی:

-خۆت هیلاکو بێ تاقەت مەکە، من دووسالە هەموو شتێك دەزانم، منیش بەرامبەر بەتۆ هەستم هەیە بەلام ناتوانم ئاشکرای بکەم ئەوەش لەبەر دوو هۆکارە:

من بەهۆی پێویستی دینەکەمەوە، لەگەڵ کچێکی نامەحرەمدا کە نیکاحم نەکردبێت ناتوانم یاری هاوسەرگیری و کاری هەڵەو نهێنی بکەم.

لەبەرئەوەی حاڵەتێکی وەهاش بوونی نەبوو نەمدەتوانی وەلامی ئێوەو هەستەکانتان بەئاشکرا بدەمەوەو، لەبەرئەوە ئێوەم لەناخمدا ناشتو شاردەوە.

دووەمینیش، تۆ کچی کۆمەڵگەو کلتوورێکی جیاوازیت، دەزانم کە تۆ بەمن نادەن، دەشزانم ئەگەر بشکرێت، تووشی بەربەستو نارەحەتی زۆر دەبین، نەمتوانی ئەو سەرکەشییە بنوێنم، تۆ لەکۆمەڵگەکەی خۆتدا ئاسوودە دەبیت، بەبڕوای من ئەویٚ هەڵبژێرە.

من زۆر بەتوندی بەرپەرچم دایەوەو وتم:

—نەخێر، بەلامەوە گرنگ نیە کیٚ چی دەڵێت:

ئەگەرتۆ منت بووێت، من هەموو شتێکم ئەخەمە مەترسییەوە، پاشان لەبەرچی سەرەڕای ئەوەی کە منت خۆش دەوێت کەچی هیچ خۆت دەرنەدەخست؟ زۆر مەراقی ئەوەم کردووە.

—من لەلایەن دەوروبەرمەوە بەکەسێکی مولتەزیم ناسراوم، هەموان ئارەزووی خۆیانە چۆن بیانەوێت دەتوانن ئەم یارییانەی عەشق بکەن بەڵام من هەرگیز... چونکە ئەوانەی چاودێری من دەکەن لەهەڵسوکەوتەکانمدا بەدوای ڕاستیو دروستی ئەوشتانەی کە باسیان دەکەمو ئەو بیرۆکانەی کە پشتگیرییان دەکەم دەگەڕێن، هەروەها ناکرێت بەزمان ناوی خواو پێغەمبەرو دین بڵێینو سەرکەشی عیشیقیش بکەین کە لەگەڵ هیچ جۆرە یاسایەکی دیندا ناگونجێت. ئەمە دژ بەفەلسەفەی بیروباوەڕی منە. عیشقەکەم لەناخمدا دەنێژم، ڕەنگیشە لەژوورەکەمدا دەرگا لەسەر خۆم دابخەمو بگریم، بەڵام

ناتوانم خۆم ڕسوابکەم، بەڵام ئەگەر کارەکە بەجددیو ڕەسمی بێت، ئەوەشتێکی ترە...

وتم: من بۆئەوە ئامادەم.

سەری لەقاندو وتی:

–زۆر ئەستەمە، ناتوانین لەمەیاندا سەرکەوتووبین، بالەسەرەتای کارەکەوە وازبهێنین، خێزانەکەی من بەمە ڕازی نابن، ئەوە خێزانەکەی تۆ هەرهیچ! ناتوانین بەتەنها هاوسەرگیرییەك بکەین کەخێزانی هەردوو لاپێی ناڕازی بن، پێویستە لەجێی ئەوەی بەهەست بڕیار بدەین، بەعەقڵمان بڕیار بدەین.

زۆر پێ داگریم کرد، پاڕامەوە، تەنانەت بەسەعات فرمێسکم هەڵڕشت، بەڵام نەمتوانی قایلی بکەم.

لەکاتی ڕۆیشتندا وتم:

–ئەگەر تۆ بەمن ڕازی نەبیت! یان مردن هەڵدەبژێرم یاخود تا مردن چاوەڕێت دەکەم.

لەبەرامبەر ئەمەدا کەمێك وەستاو وتی:

–ناتوانم بەڵێنێکی تەواوت پێ بدەم، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم بابەتە بۆتۆ ڕێگەیەکە گەڕانەوەی نییە، کەواتە باپێکەوە بەدوای ڕێگەیەکی دەرچووندا بگەڕێین. وای خوایەگیان، خەریك بوو لەخۆشیدا باڵم دەگرت، وام دەزانی هەموو دونیا بووەتە موڵکی من، لەوکاتەدا

خۆشحاڵترین کەسی دونیا من بووم، تەنانەت ئەو قسە سادانەش بۆ من بەس بوو، چونکە ئەوم زۆر خۆش دەویست.

لەکاتی ڕۆیشتنیدا بەڵێنێکی لێ وەرگرتم:

-کەس نابێت بزانێت ئێمە یەکمان دیوە.

بەڵێنەکەم قبووڵ کرد، دواتر دووبارە ئاوڕی دایەوەو وتی:

-خەفەت مەخۆ! ئەگەر تۆ بڕیارت داوە تەمەنێك چاوەڕوانی من بیت! هەستەکانی منیش کەمتر لەوانەی تۆ نییە، ئەگەر ئەم هاوسەرگیرییە ڕێك نەکەوێت تاکۆتایی تەمەن چاوەڕێی یەکتری دەکەین تا ئەوکاتەی بەرەو ئاخیرەت کۆچ دەکەین.

تەنانەت ئەمەش بەڕێیەکی ڕزگاری بۆمن لەقەڵەم دەدرا.

ئەم عیشقە گێژەڵوکەی هەڵکردبوو لەژیانمدا، ئەوەندە بەهێزو سوتێنەر بوو کە دەموت "یان بۆئەو" یان "بۆ گڵ".

تا کۆتایی هاتنی زانکۆ چەند جارێکی تریش یەکترمان بینی، بەدوای ڕێگە چارەیەکدا دەگەڕاین. بەڵام ڕێگەیەکی ژیرانەمان دەست نەدەکەوت.

زانکۆ تەواو بوو، بەڵام بەفەزڵی پەروەردگار هەردووکمان ناومان لەهەمان قەزای سەر بەهەمان پارێزگا وەك مامۆستا هاتەوە، قوتابخانەکانیشمان لەیەکەوە نزیك بوون.

ئێرجان خانوویەکی بەکرێ گرتو لەگەڵ هەندێك قوتابیدا دەمایەوە منیش لەگەڵ خانمە پەرستارێکدا دەمامەوە، خانمێکی دیندار بوو، کتێبەکانی ئێوەی دەخوێندەوە.

ئێرجان یەکەم کەس بوو کتێبەکانی ئێوەی پێدام.

"ئەوپیاوەی لەدووی خۆی دەگەڕێت و، خۆم دۆزییەوە و، محمدی دوزجەیی.." لەدوای عیشق، قۆناغێکی تر لەژیانمدا دەستی پێکرد کە دووبارە گێژەڵوکەی لەژیانمدا هەڵگیرساندەوە، ئەوەبوو دواتر دەستم کرد بەخوێندنەوەی پەیامەکانی نوور، هاوڕێ پەرستارەکەم لەم بوارەدا شارەزابوو لەبەرئەوە هاوکاری دەکردم.

خوا لێیان ڕازی بێت، بەهۆی ئێرجانو ئەو خانمە پەرستارەوە توانیم دەست بەکوچەیەکی ڕێگای ڕاستەوە بگرم.

دەستم بەنوێژکردو حیجابم پۆشی. کاتێك خێزانەکەم بەمەیان زانی، قیامەتیان هەڵگیرساند. لێدان، قسەی ناشیرین.. ئیهانە کردن... دایكو باوكو براکەم وەك تاوانباریان لێ هاتبوو.

-چۆن تۆ نوێژ دەکەیت؟ بەرامبەر کلتوورو بیروڕاکانت بەپێچەوانەوە هەڵسوکەوت دەکەیت؟ لەشێوازی ژیانی ئێمەدا نوێژو ڕۆژوو نییە! وەرەوە سەرخۆت! خوای گەورە ئارامیو هێزی پێ بەخشیم و بەرگەم گرت، بەڵام دوای ماوەیەك خێزانەکەم منیان لەمنداڵی خۆیانو میراتی بێ بەش کرد.

ئەمە بەڕواڵەت تاقیکردنەوەیەکی پڕ ئازارو بەرگە نەگر بوو، بەلام خوای گەورە هیچ بەندەیەکی بە بێچارەیی جێ ناهێڵێت... بەرەتکردنەوەی خێزانەکەم کارەکەی ئێمە زیاتر ئاسان بوو.

لەکۆتاییدا لەگەڵ ئێرجاندا هاوسەرگیریمان کرد، بێگومان هەردوو خێزانەکە ناڕازی بوون، بەلام خێزانەکەی ئێرجان کاتێك زانیان من گەڕاومەتەوە زۆر خۆشحاڵ بوون و، بەمن ڕازی بوون.

ژیانێك دەستی پێکردبوو کە هەموو ئازارەکانی ڕەواندبوومەوەو خۆشیەکان بەرەو ڕوومان پێ دەکەنین، بەپێی ئیمکانیاتەکانی خۆمان ماڵێکمان دروستکرد.

هاوەڵەکانی ئێرجان بووبوونە دایكو باوك بۆمان بێ ئەوەی بکەوینە ژێر باری قەرزی گەورەوە، توانیمان پێداویستیەکانی ماڵەکەمان تەواو بکەین.

لەدوای هاوسەرگیری کردن لەگەڵ ئێرجاندا خۆشەویستییەکەم بۆئەو تەواو نەبوو بەڵکو زیاتر بلێسەی سەند. نەمدەتوانی تەنانەت بۆساتێکیش بێ ئەو ئۆقرە بگرم، چاوم لەو زیاتر هیچ کەسێکی تری نەدەبینی. ئەو، ئەوەندە کەسێکی ڕاستگۆو مەردو فیداکاربوو کە وام دەزانی من بەختەوەرترین ئافرەتی دونیام.

بەلام مامۆستا! تاقیکردنەوەی ژیانی من کۆتایی نەهاتبوو، بگرە تازە دەستی پێدەکرد.

ئەو ڕۆژەبوو کە زانیم حامیلەم بەو ئێرجانەی کە ناوی باوکی هەڵگرتووەو تاقانەی ژیانمە.

ڕۆیشتم بۆلای ئەو پەرستارەی کە پێشتر لەگەڵیدا دەمامەوە.

تاقیکردنەوەی بۆ ئەنجام دام‌و موژدەی پێدام، بۆ زووتر گەیشتنە ماڵەوەو پێدانی ئەو موژدەیە بەئێرجان ئارامم لەبەر بڕابوو.

بەڵام لەدەرگای نەخۆشخانەدا ئەو هەواڵەم بیست کە ژیانمی تاریک کردو خەیاڵەکانمی ڕووخاند، ئەمبولانسێك گەیشتە بەشی فریاگوزاری نەخۆشخانەکە. خەڵك بەدەوریدا ڕایان دەکرد، گوێم لێبوو کەسێك وتی: "ئەوە ئێرجانی ئێمەیە.. " "ئەوە ئێرجانی ئێمەیە..."

بێ ئەوەی بپرسم کام ئێرجان هەر لەوێدا بوورامەوە.

بەڵێ، ئەوە ئێرجانەکەی ئێمەبوو، ئەو عەشقە گەورەکەی منو خۆشەویستەکەی من بوو کە ئامادەبووم ژیانمی لەپێناودا بەخت بکەم.ئەو پیاوەکەی ژیانم ئێرجان بوو...

دوای ئەوەی لۆرییەك ئیستۆپی لەدەست دابوو و، بەرەو ڕووی قوتابیەکانی‌هاتبوو.

بۆڕزگارکردنی دوو قوتابیەکەی کە لەسەر ڕێگاکە بوون ئێرجان خۆی فڕێ دابوویە سەر ڕێگاکە، منداڵەکان ڕزگار بکات، بەڵام فریای خۆی نەکەوتبوو..

هـەموو شارۆچـکەکە تـەعزێیان گێـڕاو فرمێسـکیان ڕشـت، منـیش مردوویەکی زیندوو بووم کە بەتەواوی تیاچووبووم، هـەزارجار دوعـام کرد پەروەردگارم "منیش بەرەلەگەڵ ئەو.."

نـەکرا. بـەلام مـن تائێسـتاش بـۆ گەیشـتنەوە بـە خۆشەویسـتو مەعشـوقەکەم بەحەسـرەتەوە دەپاڕێمـەوە، ئیشـەللا زۆر ناخایـەنێت ئەو دەرگایە دەکرێتەوە.

"بەرامبەر بە ڕەحمی خوا بێ ئومێد نابم".

ئێستا بەبۆنی ئێرجانی کوڕم، هێزو گوڕ دەبەخشمەوە بەژیانم ئەو هێشـا تەمـەنی دووسـاڵە. تائێسـتاش نـەمتوانیوە خـۆم کۆبکەمـەوە، بـەبیانووی هاوسـەرگیرییەوە چـەندین داواکـارم یـەت، بـەلام مـن هەمووان دەردەکەم، ئەو تەنها بەجەستە مـردووە، بـەلام لەماڵەکـەی مندا هەمیشە زینـدووە، هـەروەها ئـەو سـەرنجە پڕشـەوقانەی هێشـتا لەخەیاڵەکانمـدا بەگیرسـاوی ماونەتـەوەو، قسەشـیرینەکانی هێشـتا لەگوێمدا دەزرنگێنەوە.

هەموو ڕۆژێك قورئانو جەوشەن بۆ ڕۆحی ئەو دەخـوێنم، لەهـەموو هەفتەیەکدا ڕۆژێك سەردانی گۆڕەکەی دەکەم.

تـەنها ئارامییـەکمو تـەنها دۆسـتێکم ئیمـانو کـۆڕە ئیمانیەکانـە، خێزانەکەی ئێرجان خوا لێیان ڕازی بێت بەتـەنیا جـێم نـاهێڵن، بـەلام هیچ دەنگو باسێك لەخێزانەکەی خۆمەوە نییە.

براکەم نامەیەکی بۆناردبووم لەسەری نووسرابوو "ئۆخەیش"
چی بکەم؟ ئەوان وا دەزانن ئەوشتەی ئەوان بیری لێ دەکەنەوە
ڕاستییەکەیە، وەڵامم نەدایەوە بەڵام هەمیشە دوعا بۆ ڕزگاربوونیان
دەکەم..

بمبەخشە مامۆستا.. دووبارە هەموو گیانم وەك سەهۆڵ ساردبوو.
توانام نەما، خۆزگە ئێستا ئەو دەستەسڕانە دەبینن کە
بەفرمێسکی من تەڕ بوون.

دەزانم سەرم ئێشاندن!

تکا دەکەم دوعا بۆ ئەو عیشقە گەورەیەم "ئێرجان" بکەن.
فاتیحای بۆ بخوێنن من بۆخۆم هیچم ناوێت، تەنها ئەو باش بێت
بەسە..

هیوادارم... پەروەردگارم هەرچی زووترە من بەو شاد بکاتەوەو،
تەمەن درێژی بە ئێوەو خۆشبەختیو دڵخۆشیش بەخێزانەکەتان
ببەخشێت.خوایارو هاوکارتان بێت...

(ناوەکەی پارێزراوە)



# منداڵەکەم لەنەخۆشخانە

## بەجێهێشتو هەڵهاتم

گەنجێتی ئەو هەستە بەمرۆڤ دەبەخشێت کە نەپیردەبێت و، نە دەمرێت و نە لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

مرۆڤ لە قۆناغی لاویدا وادەزانێت کە ژیان هەربەو شێوە پەمەییە ڕێ دەکات و، ئازارو ناڕەحەتی بوونی نابێت! واهەست دەکات دەتوانێت ژیانێکی بێ سەرەو بەرەو بێ غەمو پەژارە بژی...

نازانێت کە هەموو گەنجێك پیر دەبێت و، هەموو لەدایك بوویەك دەمرێتو هەموو مردوویەکیش لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

لـــەدونیادا بەویژدانەکـــەی‌و لەقیامەتیشـــدا بەئیمانەکـــەی لێـــی دەپرسێتەوە.

لەناخی هەموو کچێکی گەنجدا حەزگەلێکی پـەنهان هەیـە، حـەزی بوون بەشازادە، حەزی بوون بەخاوەنی ژیانێك کـە هـەمووان ئێرەیـی پێ ببەن‌و نەتوانن بەدەستی بهێنن، حەزی هاوسەرگیری کردن لەگەڵ قۆزترین‌و ڕاستگۆترین کوڕی دونیادا....

هیچ نەبێت سەرکەشییەکانی ناو دڵی من بەم جۆرە بوو..

زۆرجار مـرۆڤ لـەپێناو گەیشـتن بـەو خەیاڵانـەی کـە بـەدیهێنانیان ئەستەمە دەکەوێتـە نـاو هەڵـەی زۆر گـەورەوە کـە ژیـانی ژێـرەوژوور دەکەن.

منیش یەکێك بووم لەو کەسانەی کە کەوتمە ناو ئەو هەڵانەوە.

مـــن ئێســـتا تەمـــەنم پەنجاســـاڵەو لـــەژوورێکی نەخۆشـــخانەدا گوناهەکانی ڕابردووم ئازارم دەدەن...

نە شازادەکان‌و نە دۆستە بـەوەفاکانم کـە هـەمووان ئێرەییـان پـێ دەبردم لەسەریان، چیتر لەدەوربەرمدا بوونیان نەماوە.

وەك کەسـێك کـە بـەجێ هێڵـدراوە، لـەناو ئـازاری ویـژدان هـەموو ساتێك دەمرم‌و زیندوو دەبمەوە.

با لەسەرەتای چیرۆکەکەمەوە دەست پێ بکەم تا ئێوە بـزانن ئـەم بەنـدە ونبـووەی کـە ئێسـتاکە کۆتـا سـاتەکانی ژیـانی دەژی چـۆن

ئیفلاسـێکی کـردووە. دایـكو بـاوکم لـەناو کلتـورێکی دەمارگیریـدا پـەروەردە بووبـوون، لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر تونـدو تیـژ بـوون، بـۆ ناچـارکردنی مـن بـەو شـتانەی کـە خۆیـان دەیانویسـت یاسـای زۆر قورسیان بەسەردا دەسەپاندم.

ئەگـەر بـەگوێم نەکردنایـە، قیامـەتیان هەڵدەسـاندو ئـەو ڕۆژە لەماڵەوە هەر مەحکەمەو مەحکەمەکاری دەبوو.

هەرچـی منـیش بـووم، تاخوابیـەوێت سـەر ڕەحـەت بـوومو حـەزم لەگەڕان بوو، بـەو حاڵەمـەوە کـە حـەزم لـە چـوونە ژێربـاری فـەرمان نەبوو بەبەردەوامی لەگەڵ ماڵەوەدا لەکێشەدابووم.

شەڕی ئێمە تەواو نەدەبوو.

لەبەرئەوەشـی کچـێکی زۆر جـوان بـووم، هـەرکات بچـوومایەتە دەرەوە ئـەو ئاوڕانـەی کـە لـێم دەدرانـەوەو گرنگـی پێـدانو قسـە جوانـەکان مێشـکمیان پڕکردبـوو و، بەتـەواوی بـاوەڕم بـەوە بـەهێز دەبوو کە من وەك شازادەیەك وام.

دەمەقاڵێو شەڕی نێوان منو خێزانەکەم زۆر بێزاری کردبووم.

ئەوان کچێکی سەلارو بەناموسو گوێڕایەڵیان دەویست کـە هـەموو شتێکیان بەقسەبکاتو لێیان دوور نەکەوێتەوە.

منیش کەسێکی عینادو سەرسەخت بووم و، دەمویست تـامی ژیـان بکەمو ببمە جێی سەرنجی کوڕان..

لەکۆتاییدا ڕووداوەکان ڕوویاندا...

ئەو هاوینـەی کـە ئامـادەیی پیشەسـازی کچـانم تـەواوکرد، لەگـەڵ فەرمانبەرێکی پۆلیسدا کـە لـەزووەوە بەدەورمـدا دەهـاتو قەناعـەتی پێ کردبووم کەئەو باشترین کەسی دونیایە، هەڵهاتم.

من چیتر بووبوومە شازادەیەك، پێم بە زەویدا نـەدەنا، وام دەزانـی بوومەتە قارەمانی چیرۆکەئەفسانەییەکان...

هیچ کات بیرم لەوە نەکردەوە کە ئەم ڕووداوە چۆن دایكو بـاوکمی تووشی نەهامەتی کردو ژیانی لێکردن بە زیندان.

لەدوای دوومانگ لەژیانی هاوبەش، خێزانەکەی بێ ویژدانانە منیـان فـڕێ دایـە دەرەوە، مێردەکەشـم کـەزۆر زوو بێـزار بـوو لـەم هاوسەرگیرییە، وادیاربوو بەمە ڕازی بوو.

کـێ حـەقی هـەبوو بەسـەر کچێکی سەرشـێتی لەخۆڕازییـەوە کـە گوێڕایەڵی قسەی نەدەکردو دەیویست هەموو تەمەنی بـە ڕابواردنـەوە بەسەر بەرێت؟

چـیتر مـن نەمـدەتوانی بگەڕێمـەوە بۆماڵـەوە، تەنانـەت ئەگـەر بشگەڕامایەوە باوکم قبووڵی نەدەکرد، لەو ماوەیەدا هـەواڵی ئەوەشـم نەبوو کە دایکم تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە.

ئەو داماوە ئەوەندە خەفەتی خواردبوو، ئەو خەفەتە هۆشو بـیری لێ بڕیبوو دواتر بەو خەیاڵەوە کۆتایی پێ هاتبوو. باوکیشم بەتـەواوی

خۆی لەخەڵکی دابڕیبوو و خۆی لەماڵەوە بەند کردبوو و نەیدەهێشت کەس بیبینێت لەڕاستیدا قورس نەبووکە بزانرێت حاڵەتی دەروونی ئەو لەچیدایە.

منیش چوومەلای ناسیاوێکمان کەلەشارێکی تر دەژیا، ئەوانیش کوڕێکی گەنجیان هەبوو، ئەمجارەش بەهۆی ئەوەوە کەوتمە کێشەوە، یاخود ڕاستتر بڵێم من بەهەڵسوکەوتەکانم ئەویشم تووشی کێشەکرد.

ئەوانیش کاتێك هەستیان بەمەکرد، بێ بیر کردنەوە فڕێیان دامە کۆڵان، لەدوای ئەمەوە دەمزانی دەبێ بۆ کوێ بڕۆم.

یان بەرەو مەرگ؟ یاخود دەکەوتمە دەستی بازرگانەکانی ئافرەت...

دووبارە بەهاوکاری هاوڕێیەکم وەك کارگوزارێك، لەیەکێك لە ئوتێلەکاندا دەستم بەکارکردن کرد، من پێویستم بەشوێنێك بوو لێی بژیم، کاتێك لێرە ئەویشم دەست کەوت کەمێك ئارام بوومەوە.

بەڵام وەك بڵێی شوێن ئاسەوارەکانم کەوتبوون، کەسە نیەت خراپەکان ئێخەیان بەرنەدام.

ئەمجارەش باوەڕم بە قسەڕازاوەکانی پیاوێکی تەمەن مامناوەند کردو دەستم کرد بەبەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی ئەو... لەوماوەیەدا

دووگیان بووم‌و بەهۆی کێشەیەکی تەندروستیمەوە نەمتوانی لەباری ببەم.

ئەو پیاوەی کە لەگەڵیدا بووم، پێی وتم ئەگەر لەو منداڵە ڕزگارم ببێت ئەوا دیسان ئەو هەر منی دەوێت.

بەداخەوە کە ئەم هەڵەیەشم خستە سەر ئەوانی تر کە بەدوای یەکدا ڕیزم دەکردن.

لەیەکێك لەنەخۆشخانەکاندا ئەومناڵەی کەهێنامە دونیاوە بەجێم هێشت‌و هەڵهاتم، بەڵام ئەو منداڵە هیچ کات لەپێش چاوم لانەدەچوو، ئەو کاتە تێگەیشتم کەهەستی دایکایەتی هەستێکی زۆر جیاوازە.

من لەباوکمەوە خاڵێك لەلای ڕاستی دەم‌و چاومدا هەبوو، ئەو منداڵەش بەهەمان شێوە خاڵێکی گەورەی لەدەم‌و چاویدا هەبوو.

ساڵانێك تێ پەڕین... لەگەڵ چەندەهاکەس ژیانم دەست پێکردەوە ژیانی چەندەها کەسم تێکدا.. بەڵام تەمەن زۆر زوو تێپەڕی تەنانەت وەفاتی باوکیشم لەدوای ساڵانێك بیست.

کاتێك کە پیری هات‌و لەدەرگای دام.. ئەوکات زانیم کەهەموو شتەکان دانەدانە لەدەست دەچوون.

بەو میراتیە کەمەی کە لەکۆتا هاوسەرمەوە بۆم مابوویەوەو چوومە خانەی بەساڵاچووانەوە، لەبەر ئەوەشی زۆر ناساغ بووم نەخۆشخانەیەکیشم وەك ماڵی دووەم بۆخۆم گرت، دەستم کرد

بەوەرگرتنی چارەسەری ئەو نەخۆشییەی کەتاکۆتایی تەمەنم درێژە دەخایەنێت.

یاریدەدەرێك هاتە لای ئەو دکتۆرەی کە ماوەیەکی زۆربوو تەداوی دەکردم، لەیەکەم بینینمدا خاڵەکەی دەمو چاوی سەرنجی ڕاکێشام و، بردمیەوە بۆ ساڵانێك لەمەوبەر، لەساتێکدا زۆر تێکچووم.

تۆبڵێی ئەمە ئەو منداڵە بێت کەلەنەخۆشخانەکە جێم هێشتو هەڵهاتم؟ ئایا شتی وادەبوو ببێت؟! بەبەراورد لەگەڵ ئەو ساڵەی کە جێم هێشتو تەمەنی تەخمینی ئەو گەنجە گونجاندنێکی زۆر هەبوو.

سەیری ئەوەبکەن! ئەو کورەی کە لەسوچێکی نەخۆشخانەدا بەجێم هێشت ئێستا بۆ تەداوی کردنی من هاتووە!

خوایەگیان چۆن شتی وا دەبێت؟

بەڵام ئەوە ڕووی دا..

لەو زانیارییانەی کە لەخۆیم وەرگرت وادەردەکەوت کە ئەو کوڕی ڕاستەقینەی منە، کوڕەکەی من لەدوای ساڵانێك بوەتە دکتۆرو بۆ چارەسەرکردنی من هاتووە.

بێگومان نەمدەتوانی ئەو بابەتەی لەگەڵدا بکەمەوەو ئەو بخەمە بارێکی سەختەوە.

من کە بە کەسێکی خراپ ناوم دەرکردبوو لە کۆمەڵگەدا حەقی ئەوەم نەبوو ئەو بەلای میراتی گوناهکارانەی خۆمدا ڕابکێشم.

ئێستاش هەموو بەیانیەك چاوەڕێی ئەوەم بێت و بە قسە شیرینەکانی و سەرنجە پڕ شەوقەکانیەوە بڵێت:

—ئەمڕۆ حاڵت چۆنە پووری!

ئەو قسەیەی ئەوەندە دەبێتە شیفا، کەهیچ دەرزی و هیچ عیلاجێك بەو شێوەیە ئارامیم پێ نابەخشێت.

من بەحەسرەتەوە دەژیم لەگەڵ کوڕەکەم کە لەپێش چاومدایە و بەحەسرەتیشەوە دەمرم..

وای لەهەڵەکانم! وای لەخەتاکانم!!

بەدڵنیاییەوە بەمە دەڵێن: "مردنی پێش مەرگ"

ئەی لێپرسینەوەی هەموو ئەمانە؟

هەر لەئێستاوە دەستم بەلێپێچینەوە کردووە لەناخ و ویژدانی خۆمدا لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایش لەولاوە بوەستێ!! تەنانەت نامەوێت بیریشی لێ بکەمەوە!

ئەی کچەگەنجەکان! من کەوتم تکایە ئێوە مەکەون!

دایك و باوکتان مەخەنە لایەکەوە و خۆتان ڕێی ژیان هەڵبژێرن.

ئەو ڕێگایانە زۆر بەئازارو پڕ دڕکن. بائەمە ببێتە وەسیەتی من بۆئێوە...

**(ناوەکەی پارێزراوە)**



# ژیانم گۆڕا

ڕۆژباش جەنابی کاک خالید؛

زۆر ناڕەحەت بووم بەوەی کە نەتان توانیوە ئەو ئیمەیڵانە بخوێننەوە کەبۆم ناردبوون، لەسەر داوای خۆتان وادووبارە بۆتان دەنووسمەوە.

من تەمەنم بیستونۆساڵەو دووساڵە هاوسەرگیریم کردووە هێشتا خاوەنی منداڵ نیم، چاوەڕێی تەقدیری ئیلاهین.

هاوسەرەکەم بەڕەگەز ئەمریکییەو ناوی (محمد بیل)ە، ئەو دەساڵ لەمەوبەر لەعەرەبستانی سعودی لەکاتی بەجێهێنانی ئەرکێکدا حەزی

لەموسوڵمانێتی کردووەو لەسەر دەستی کەسێکی ئەوێ موسوڵمان بووە.

هاوسەرەکەم زۆر ڕوو خۆشەو، تابڵێی کەسێکی جوانە.

هەمیشە بیردەکەمەوە کە چۆن بتوانم پاداشتی ئەو بدەمەوە.

لەخوا دەپاڕێمەوە هەمووان بەکەسانی باش بناسێنێت.

کاك خالیدمن لەئەنقەرە نیشتەجێم، دانیشتووی (چانکایا)م، دایكو باوکیشم لە (ئێلڤانکێنت)ی ئەنقەرەدا نیشتەجێن.

هاوسەرەکەم پسپۆڕە لەبواری پڕۆژەداو لەدەرەوەی وڵات بە گرێبەست کار دەکات، بێگومان بەهۆی ئەمەشەوە هاتنو ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی وڵات زۆر ڕوودەدات.

داواکارم کە پەروەردگار هاتووچۆی بێ بەڵاو موسیبەت بەنسیبمان بکات، مرۆڤ هەر ئەوەندەی لەشی ساغ بێت کێشەکانی تر بەشێوەیەك چارەسەر دەبن.

بەنزیکەیی ئەوە بۆ سێ ساڵ دەچێت، لەپشوویەکمدا کتێبی "جانان"ی ئێوەم خوێندەوە، زۆر کاری تێکردم لەبەر خۆمەوە دەموت خوایەگیان ئەم کابرایە کێیە؟ تۆ بڵێی خالید ئێرتۆغرۆڵ ئێستا لەژیاندا مابێت! لەمێشکی خۆمدا دیالۆگێکم لەگەڵ خالید ئێرتۆغرۆڵدا ڕێکخستبوو، بەم شێوەیە ئێوە هاتنە ناو باسو خواسەکانی منەوە بێ ئەوەی لەبوونی من ئاگاداربن.

هەموو کتێبەکانی ئێوەم کڕی، دەم خوێندەوەو بەکەسی تریشم دەدا تا بیخوێننەوە، وەك ئەوەی ئەگەر بەوشێوەیە هەڵسوکەوت بکەم ئەوا خزمەت بەئاینی ئیسلام دەکەم.

ڕۆژێك لەخۆم تووڕە بووم: "چۆن دەکرێت! ئەو هەموو کتێبە بخوێنیتەوە، بەڵام گەورەترین نیعمەتێك کەخوای گەورە پێی داوین ئەویش قورئانە، نەزانیت بیخوێنیتەوە."

بەڵام لەکویٚ بمزانیبایە!

لەپشوودا دەڕۆمەوەو خۆم لە کۆرسی قورئان خوێندنەوە ناونووس دەکەم، خودا بەنسیبی هەموو لایەکی بکات.

بەڵام هێشتا ناتوانم قورئان بەدەنگەوە بخوێنمەوە، ئەوەیش زۆر ئازارم دەدات، واتە لەتوانامدا نییە، بۆ خوێندنەوەی قورئان بە دەنگەوەمرۆڤ پێویستە بیسەرێکی باش بێت، ئەوە تەمەنم گەیشتۆتە (٢٩) ساڵ تا ئێستا نەمتوانیوە یەك گۆرانی بەئاوازەوە بڵێم، لەبەر ئەوەی زۆر بێتاقەتم، پێم وابێت ناتوانم بەدەنگەوە بخوێنمەوە.

کاك خالید لەسایەی ئێوەوە سەرجەمی پەیامەکانی نوورم کڕیوە، کڕیومە بەڵام هەروا دامناون، تەنانەت یەك ڕستەشی لێ تێ ناگەم، زمانی نووسینەکەی زۆر قورسە، بەڵام بەهەر نرخێك بێت ڕێگەیەك بۆ تێگەیشتنی‌و سوودوەرگرتن لێی دەدۆزمەوە.

دەتوانم کتێبە کلاسیکیە بیانییەکان بەزمانی ئەسڵی بخوێنمەوەو تێی بگەم بەڵام چۆنە کە ناتوانم ئەم کلتورە نایابە بخوێنمەوە؟ ئەمە چەند جێی داخە بۆئێمەی گەنج، وانیە؟

زۆر مەراقم هەیە مامۆستا، ئێوە بوونە وەسیلەی ڕێنمویی ئێمە، ئاخۆ کێ بوەتە وەسیلە بۆئێوە؟

دواتریش من دەمەوێت ببمە قوتابی ئێوە، دەمەوێت فێرببمو کەسانی دەوروبەریشم فێربکەم...

هەمووشتێکی نوێ کۆن دەبێت، هەموو شتێکی هاتوو دەڕوات، لەسەر ئێمە پێویستە ئەو شتانەی کە لەئێوەوە فێری دەبین لەدوای ئێوە بەوانی دوای خۆمانی بگەیەنین، لەبەرئەوەیە دەمەوێت سوود لەکەسانی شارەزاو خاوەن زانیاری وەك ئێوەوەربگرم.

ئەگەر خوا بیەوێت، پێم خۆشە بتان ناسمو بەشداری کۆڕو گفتوگۆ بۆن خۆشەکانتان بکەم، موحەمەدی هاوسەرم سڵاوی بۆتان هەیە، پرسیاری چاپی ئینگلیزی کتێبەکانی ئێوەی لێ کردم.

ئایا کتێبەکانی ئێوە چاپی ئینگلیزی هەیە؟ ئەگەر هەیە لەکوێ دەستم بکەوێت؟ دەمەوێت بۆ هاوسەرەکەمی بکڕم تائەویش سوودیان لێ ببینێت.

سوپاس بۆخودا، لەسایەی ئێوەوە خۆم داپۆشیو دەستم بە نوێژکردن کردووە، ڕەنگە ئەمە گەورەترین خۆشحاڵی بێت بۆهەر

کەسێك لەبەرئەوەی ئێوە بوونە هۆکاری ئەمە، لەهەموو نوێژێکدا دوعاتان بۆدەکەم.

من تەنانەت جگەرەشم دەکێشا، لەسایەی ئێوەوە ئەویشم تەرك کرد.

لەئێستادا شتێك هەیە کە باوەڕم پێی هەیەو هەستی پێ دەکەم ئەویش ئەوەیە کە؛ پەروەردگار دەیەوێت ئێوە ببنە هۆکاری هیدایەتی من، باوەڕم وایە هەموو کەسێك دەرگایەکی هیدایەتی هەیە، بەر لەوەی ئەو دەرگایە بەڕوومدا داخرێت وەك گورگی برسی پەلاماری کتێبەکانی ئێوە دەدەم.

دوێنێ نیوەڕۆ لەکاتێکدا باسی ئێوەو کتێبەکانی ئێوەم بۆ کچێکی دراوسێمان دەکرد ئەو وتی: "خالید ئێرتوغرۆڵ لەزانکۆ مامۆستای منە".

زۆر سەرسام بووم! وەك بڵێی هەمووشتەکان لایەنگری ئێوەن، چیتر هۆکارەکان لەبەردەممدا ئاسان بوو بۆ گەیشتن بەجەنابتان لەبەر ئەوەش هەموو ئازایەتی خۆم کۆکردەوەو بڕیارم دا ئەم ئیمەیڵەتان بۆبنێرم.

دەموت وەڵامم ناداتەوە، بەڵام دڵنیام دۆستانی خودا کەس بێ وەڵام ناهێڵنەوە.

لەخەونمدا هەموو بەشەكانی پەیامەكانی نوور بەهەموو بەرگەكانیەوە لەبەردەممدا دانرابوو پێم وتن:"ئێوە زۆر قورسن من ناتوانم بتان خوێنمەوە! تێتان ناگەم"

-كاتێك ئەو خەونەم دی هێشتا پەیامەكانم نەكڕی بوو- كاتێك كڕیم بۆ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت هەمان ئەو وشانە هاتنەوە سەر زوبانم، لەبەرئەوە دەمەوێت ئێوە هاوكاریم بكەنو فێرم بكەن، منیش حەزم لێیە لەڕێی خوادا خزمەت بكەم.

مامۆستا، وەڵامەكانی ئێوە زۆر خۆشحاڵم دەكەن، خودا ئێوەش خۆشحاڵ بكات.

من دەرچووی ئامادەییم، نەمتوانی زانكۆ بخوێنم، دەمویست ببمە مامۆستا بەڵام بەنسیب نەبوو، باهیچ نەبێت لەسایەی ئێوەوە فێربوونی پەیامی ئیسلامی ببێتە نسیبم.

براكانم موراتو سەرهات زۆر سەلامیان بۆتان هەیە، ئەوانیش كتێبەكانتان دەخوێننەوەو زۆر بەدڵیانە، خودا لێتان ڕازی بێت.

برابچوكەكەم (سەرهات) لەسایەی كتێبەكانی ئێوەوە دەستی بەنوێژ كردووە. ئەمە منی زۆر خۆشحاڵ كردووە.

براكەی تریشم (مورات) كەساڵێك لەمن بچوكترە نوێژ ئەكات خوا قبووڵی بكات.

کتێبەکانی ئێوەم بۆ باوکیشم خوێندوەتەوە، باوکم ئێستا دەستی بەنوێژە قەزاکانیش کردووە، خوا بیکات بەنسیبی هەموومان.

بۆ وتنەوەی وانە دێنە ئەنقەرە؟ یاخود چۆن دەتوانین بەشداری کۆڕەکانتان بکەین؟

ئیمەیلێکی درێژبوو، بەلام هەولمدا ئەو دوو ئیمەیلەی تر بکەم بەیەکو دووبارە بینووسمەوە، چاوەکانتانم ماندووکرد، تکایە بمبەخشن.

هیوادارم من وەك کچی خۆتان یان قوتابیەك یاخود خوشکێکی خۆتان قبولٚ بفەرموون.

لەبیرتان نەچێت، لەئێستا بەدواوە کتبێەکانتان وەك وەسیەتێك بەهەمواندا دابەش دەکەم، إن شاءالله لەژیانی ئەوانیشدا وەسیەتی تازە دروست دەبێت.

دلم وەك مەلێك هاتو دەستی ئێوەی ماچ کرد.

زۆر سلاوم بۆ هاوسەرەکەشتان هەیە.

بەخواتان دەسپێرم.

**(ناوەکەی پارێزراوە)**



# پارووی حەڵاڵ

بۆ بەڕێز کاک خالید ئێرتوغروڵ:

یەکێك لەو خێزانانەی کەبەچڕی ئاگاداری کتێبەکانی ئێوەیە، خێزانەکەی منە.

دایکم کە تەمەنی نزیك بوەتەوە لە۷۰ ساڵی و، هاوسەرەکەم کەتازە پێی ناوەتە چل ساڵیو خۆم، هەروەها دوو کچەکەم کە یەکەمیان پۆلی هەشتەمی ئامادەییەو ئەوی تریشیان پۆلی دووەمی ناوەندەییە، ئەمانە ئەندامانی خێزانەکەمن کە کتێبەکانی ئێوەیان لەدەست ناکەوێتە خوارەوە. من فەرمانبەرم لە فەرمانگەیەکی حکومی، هاوسەرەکەشم مامۆستایە، زیاتر هاوسەرەکەم ئاگاداری

کتێبەکانتانە، چاودێری کتێبە تازەکانت دەکاتو یەکسەر دەیانکڕێت، لەشی ساغ بێت لەگەڵ ئەوەشدا کەدایکێکو فێرکارێکی زۆر باشە لەناو خانمەکانیشدا زیاتر ئەو ئەهلی خزمەتە.

ئێمەش لەگەڵ تەشویقو هەوڵی ئەودا ڕێ دەکەین.

هاوسەرەکەم داوای کرد ئەم نامەیە بنووسم، کتێبی "نامە پەند ئامێزەکان لە خوێنەرانەوە"ی ئێوەم خوێندەوە، لەو کتێبەدا نموونەی زۆر گرنگو کاریگەری تێدابوو، هەریەك لەوانە پڕبوو لە پەیامێکی وانە بەخشو ڕێ نیشاندەر.

تۆمەس لەدونیادا شتگەلێك ڕوودەدەن کە ئێمە لێیان بێ خەبەرین.

هۆکاری نووسینی ئەم نامەیەم سەبارەت بە ژیانی باوکی ڕەحمەتیمەو ئەوکاریگەرییانەی کەلەسەر خێزانەکەمان دروستی کردووە.

باوکی ڕەحمەتیم، لەوسالانەدا کە تازە هاوسەرگیری کردووە، گەنجێك بووە کە هێشتا نەیتوانیوە، ژیان و، مرۆڤایەتی و، بەندایەتی و، حەلالو حەرام بەباشی لەیەك جودا بکاتەوەو، زۆریش بۆی گرنگ نەبووەو، لەبەرئەوەی بەهەتیوی گەورەبووە، نەیتوانیوە بخوێنێت.

منداڵیو گەنجێتی بە شوانی لەشاخەکاندا بەسەربردووە، بێگومان لەو کاتانەیشدا دەستی بۆماڵی کەسانی تر درێژ کردووە. جاهیلیو نەخوێندەوارییە ئیتر...

دایکیشم ڕێك بەپێچەوانەی باوکمەوە خاتوونێکی مولتەزیمە، هیچ کات بێ فەرمانی پەروەردگار ناکات و لەحەرام نزیك نابێتەوە، لەبەرئەوەش زوو زوو لەگەڵ باوکمدا بووەتە شەڕیان.

لەکاتێکدا ئەو هاوسەرگیرییە تازەیە بەشەق و تێ هەڵدان بەڕێوەچووە، خوشکە گەورەکەم (سەعیدە) -کە دووساڵ لەمەوبەر لەڕووداوێکی دڵتەزێندا لەدەستمان دا- هاتووەتە دونیاوە، لەبەرئەوەی هەندێك لەپێداویستی منداڵ پێویست بووە باوکم ناچار بووە پارە پەیدا بکات، کاتێکیش نەیتوانیوە، دووبارە نیازی هەبووە بچێتەوە سەر خووەکەی جارانی.

لەکاتێکدا کەخەریکی شوانی بووە، بڕیاری داوە کەمەڕێك لەو ڕانەی کەنزیکیان بووە بدزێت، بیری کردوەتەوە: "دەچم دەیفرۆشم و، ئەو پارەیەم دەست دەکەوێت کەپێویستمە."

لەکاتێکدا کەڕانە مەڕەکە لێی نزیك بوونەتەوە، بەرەو ڕووی ئەو مەڕانە ڕۆیشتووە کەبەرەو چۆڵەوانیەك خل بوونەتەوە، ڕێك لەوکاتەدا مام ئەبوبەکر کە کەسێکی زۆر ڕێزداربووە دەرکەوتووە.

سڵاوی لەباوکم کردووە و وتویەتی:

-چۆنی کاك عومەر؟

باوکیشم بێ خۆتێکدان وتویەتی:

-باشم، واخەریکە لەژێر هەتاودا تەمەنم پڕ دەکەمەوە.

ئەویش وەك ئەوەی ناخی باوكمی خوێندبێتەوە وتویەتی:

–تەمەن هەر پڕ دەبێتەوە، إن شاءالله بەكردەوەی باش پڕدەبێتەوە.

پاشان بەردەوام بووە لەقسەكانی:

– بەنی ئادەم چەندە سپڵەیە، خوای گەورە بۆ ئەو دونیای پڕ لە ڕۆزی كردووە، نیعمەتی لاشەیەكی پێ بەخشیوە كەنرخەكەی ناخەملێنرێت، كەچی ئەو بێتڕوانین لەهەموو ئەمانە ڕوو دەكاتە حەرامكراوەكانی پەروەردگار، ئەی هاوار ئەم مرۆڤانە ئەوە نازانن كە مردن‌و لێپرسینەوەو دادگاییەكی سەخت هەیە.

بێگومان باوكم لەبەرامبەر ئەو قسانەدا ئەوەندە تەریق بووەتەوەو ئەوەندە شەرمەزار بووە كە هەموو لاشەی كەوتوەتە سەرئاو.

مام ئەبوبەكر بەردەوام بووەو وتویەتی:

–كاك عومەر! وابزانم كەمێك كێشەی داراییت هەیە، من كەمێك پارەت بەقەرز دەدەمێ، پێداویستییەكانتی پێ دابین بكە، دواتر ئەگەر هەتبوو بمدەرەوە، تۆ چیتر خاوەن منداڵیت كەمێك ئاگات لەڕۆزییەكەت بێت، منداڵەكان بەچی بەخێو بكرێن هەڵسوكەوت‌و خووی ئەوە وەردەگرن، ئەوشتانەی لەقوڕگت دەچنە خوارەوە تەنها تێكەڵ بەخوێنت نابن، بەڵكو تێكەڵ بەڕۆح‌و ئیمانیشت دەبن. وەك ئەوەی ئاگاداری ئەوەبووبێت كەباوكم بەنیازبووە دزی بكات، لەدوای

ئـەوەی ئـەم وانـە پـڕ مانایـەی بـەباوکم وتـووە دەسـتی کـردووە بەگیرفانیداو بڕێك پارەی دەرهێناوە:

—فـەرموو کـاك عومـەر، هـیچ خـۆت تێـك مـەدەو خـۆت تووشـی ناڕەحەتی مەکە، کەی هـەتبوو ئەوکاتـە بیهێنـەرەوە، دەی ئێسـتاش لەسەر ئێزنت...

ئەمانەی وتوەو لەوێ ڕۆشتووە.

بێگومان باوکم بەسەرسوڕماوی ماوەتەوە، ڕێك لەکاتێکدا کەخەریك بـووە خـۆی تووشـی دزی کـردن بکـات مـام ئەبوبـەکر لێـی ڕاسـت بوەتەوەو ئەوەی کردووەو ئامۆژگاریشی کردووە.

دواتر سەیری پارەکانی ناو دەستی دەکات، ئای خوایەگیان! ئەمە بڕێکـی کـەمیش نییـە! بەنزیکـەیی هێنـدەی ئـەو پارەیەیـە کـەباوکم لەچەندساڵێکدا بەدەستی دەهێنا.

یەکسەر لای کردوەتەوەو وتویەتی:

—من چی لەم هەموو پارەیە بکەم؟ بەڵام سەیری کـردووە کـە مـام ئەبوبەکر لەوێ نییە!

چۆن دەکرێت قەدپاڵێکی ئاوەها لەچەند سانیەیەکدا ببڕێت!

تووشـی سەرسـامییەکی زۆر بـووە، ئـەو ڕۆژە تـائێوارە بـیری لـە نهێنی پارەکانو ئامۆژگارییەکان کردوەتەوە.

کاتێك گوێی لەدەنگی بانگ بووە کەلە گوندەکەی بەرامبەریانەوە هاتووە یەکسەر بەرەو لای ئاوەکە ڕۆیشتووەو دەستنوێژی گرتووە، تەوبەی کردووەو دەستی بەنوێژکردن کردووە، هەروەها بەڵێنی داوە بەخوای گەورە کە چیتر هیچ شتێکی هەڵە ئەنجام نەدات.

ئێوارە ڕووداوەکانی بۆدایکم گێڕاوەتەوە، دایکم زۆر سەری سوڕماوە جارێ بە تەوبەکردنی باوکمو دەستکردنی بەنوێژ، زۆر خۆشحاڵ بووە، چیتر لەو ماڵەدا ئارامییەك بەدی کراوە کەپێشتر ئارامی وای بەخۆیەوە نەدیوە.

بەڵام دایکم بابەتی پارەکانی کردووەتە کێشەو وتویەتی کە نهێنییەك لەم کارەدا هەیە پاشان بە باوکمی وتوە:

-بڕۆ بەمام ئەبوبەکر بڵێ، ئەم بڕە قەرزە زۆر زۆرە، ئێمە پێویستمان بەپارەیەکی کەم هەیە، بابەشی پێویست هەڵبگرینو ئەوی تری بۆ بنێرینەوە.

باوکیشم ڕاز بووەو ڕۆیشتووە بەرەو لای خۆشەویستی دێیەکە مام ئەبوبەکری ڕیش سپی. مام ئەبوبەکر لەماڵەکەیدا پێشوازی لەباوکم کردووەو گوێی بۆ قسەکانی گرتووە، دواتریش باسی ئەو نهێنییەی کردووە کە تائێستاش هەمووومانی خستوەتە حاڵەتی سەرسوڕمانەوە، ئەو وتبوی: کاك عومەر! هەڵەیەك لەم کارەدا هەیە، یان گەرمای ئەم

ڕۆژانە زۆر کاری تێکردویت یاخود منت لەگەڵ کەسێکی تردا تێکەڵ کردووە. من نەتۆم دیوەو، نەپارەشم پێداویت.

باوکم لەوکاتەدا زۆر سەری سوڕماوەو هەڵی داوەتێ:

—تکات لێ دەکەم، تۆ خۆت هاتیت بۆلام، ئامۆژگاریت کردم، پارەت پێدام‌و وتت هەرکات هەتبوو بمدەرەوە.

مام ئەبوبەکری دنیادیدە سەری داخستووەو وتویەتی:

—باوەڕت پێ دەکەم، بەڵام ئەو کەسەی کە باس دەکرێت من نیم من نەخۆشم‌و لەجێگەدام، ناتوانم بڕۆمە دەرەوە، ئەگەر بشمتوانیایە بڕۆمە دەرەوە نەمدەتوانی بێمە ئەو شوێنە، بشهاتمایە ئەوەندەم پارە پێ نییە تا بمدایە بەتۆ. ئێستا بڕۆ ئەو پارەیە بۆ کڕینی پێداویستییەکانت خەرج بکە، هەر کات پارەت هاتە دەست بەسەر هەژاراندا دابەشی بکە.لەمەودواش لەپارووی حەڵاڵ خۆت لامەدە.

باوکم بەتەواوی سەری لێ شێواوە، وتویەتی: "ئەمە هەبێ‌و نەبێ کەرامەتی هاوسەرەپاک‌و دڵسۆزو دیندارەکەی منە." لەدوای ئەوەش دەستی داوەتە کاری چاکە...

**خودا لێی خۆشبێت**

بەڕێز کاك خالید! ئێمە خۆشحاڵ دەبین ئەگەر ئەم ڕووداوەی کە هەرکات ناوی خێزانەکەی ئێمە دێت بەبیریان دێتەوە، لەگەڵ خوێنەرەکانتاندا بەشی بکەن.

هیچ نەبێت بۆ هەردوو چەمکی "حەڵاڵو حەرام" چیرۆکێکی گونجاوە.

هەموو ئەندامانی خێزانەکەمو لەسەرو هەمووشیانەوە دایکم دوعاخوازین بۆ خزمەتەکانتانو کتێبەکانتان، ئێمە بۆ حەقیقەتەکانی ئیمان ڕادەکێشێت، هەروەها گەنجەتازە پێگەیشتووەکان زۆر پێویستیان بەمانەیە، هیوای سەرکەوتن بۆکارەکانتان دەخوازین، پەروەردگار یارویاوەرتان بێت.

(ناوەکەی پارێزراوە)



# تکایە هاوکاریم بکەن

تۆ بڵێی کەسی تر هەبێتوەکو من بزانێت ئەو کەسانەی کە خۆیان داوەتە دەست هێزی کێشندەی هەستە نەفسانی و شەیتانییەکانو گوناه ئەنجام دەدەنچۆن باجێك دەدەن!

پێم وانیە بەندەیەکی تری خودا بوونی هەبێت کەوەك من ساڵەکانی گەنجێتی لەنێو کاری شێتانەدا بەسەر بردبێتو بزانێت کەچۆنهەڵەی ساتێك تەمەنێك دەکاتە دۆزەخ.

وەك دەڵێن: "هەستەکان عەقڵیان نییە"، چەندە ڕاستیان وتووە! ئایا دەزانن چی بەسەر گەنجێکدا دێت کەهەموو عەقڵو هۆشی بخاتە لایەکەوەو بەپێی هەستەکانی هەڵسوکەوت بکات!

ئەگەر مەراقتان کردووە! گوێ بیستی چیرۆکی ژیانی من بن، بەشێوەیەك کەبەسەرهاتی من ببێتە وانەیەکی لەبیرنەکراو بۆئێوە.

ئێمە لەدەوروبەردا بەخێزانێکی هەژار ناسرابووین، کەس بەهەندی وەرنەدەگرتین‌و ژیانێکی سەخت و دژوارمان دەگوزەراند.

ئەوەندە شایەنی بەزەیی بووین کەبیرم نایەت ڕۆژێك پڕ بەسکی خۆمان نانمان خواردبێت، یاخود لەسەر سفرە بەتێری هەستابین، یاخود بەتێری نوستبێتین.

باوکم بەهۆی کێشەی تەندروستیەوە نەیدەتوانی کار بکات، دایکیشم بە کارەکەری کردن بۆ دراوسێکانمان هەوڵی دەدا بەپێوە بمانهێڵێتەوە.

بەڵام ئەویش لەبەرئەوەی نەخۆش بوو ئەو پارەیەی کە پەیدای دەکرد تەنانەت بەشی پارووە نانێکی وشکیشی نەدەکرد.

کاتێك دەمبینی هاوڕێکانم جلی جوانیان پۆشیوە و ڕۆژانە پارەیەکی زۆریان پێیە! ئێرەییم پێ دەبردن.

ژیانی منداڵیم بەو شێوەیە هەمووی بەدروستکردنی خەیاڵەوە بەسەربرد.

جلوبەرگی من یان جلی بەکارهێنراوی کەسانی تر بوو یاخود ئەوەی کە دەیانکردە دیاری بۆم، لەماڵەکەماندا بەپێی پێویست شت‌و مەك نەبوو، ئێمە لەهەژارییەکی لەو شێوەیەدابووین.

لەکاتێکدا کە لە قۆناغی ناوەندی بووم هاوڕێی دەوڵەمەندم هەبوو، هەمیشە ئیرەییم پێ دەبردن لەناخمدا دەموت: "دەبێت هەستی لەدەست کردنی بازنی ئاڵتون چۆن بێت!"

کاتێك دەچووم بۆماڵی هاوڕێکانم لەهەژاریمانو بەتایبەت جلەکۆنەکانی بەرم زۆر تەریق دەبوومەوەو دەچووم بەناخی زەویدا..

کاتێك شیرینیو بۆرەکیان بۆ دەهێنایەن، تەنانەت دەستیشم بۆنەدەبردن، وام دەزانی کەئەگەر بیان خۆم خیانەت لە خێزانەکەم دەکەم کەمەحرومن لەو خۆراکانە.

لەگەڵ ئەوەشی کە زۆرم حەز دەکرد، لەبەرئەوەی ماڵەکەمان لەوەزعێکی نالەباردا بوو، نەمدەتوانی هاوڕێکانم بانگهێشت بکەم بۆماڵەوە.

ئەگەر بیشیان وتایە: "با ئەمڕۆ لەماڵی ئێوە کۆببینەوە" یەك دونیا بەهانەم دەدۆزیەوە، هەمیشە خۆم شەرمەزار دەبینی.

لەدوای چوونە ئامادەییش بەهۆی ئەوەی خۆم وەك کچێکی ناشیرینو بێ چاودێری دەبینی لەکەس نزیك نەدەبوومەوەو هاوڕێیەتی کەسم نەدەکرد.

من کچێکی فەقیر بووم کە بەردەوام گاڵتە بەناشیرینییەکەم دەکرا.

بەهۆی ئەو سنووکایەتیو جیاکارییانەوە، لەقۆناغی ئامادەییدا تووشی پەیوەندی هەڵەی هاوڕێیەتی نەبوومو نەکەوتمە ناو ئەو هەڵانەوە کەکچەگەنجەکان بەبەردەوامی دەکەوتنە ناویەوە.

لەبەرئەوەش لەوانەکانمدا سەرکەوتووبووم، مامۆستاکانم تەشویقیان دەکردم بۆ بەردەوام بوونم لەخوێندن، بەڵام چاوی هەژاری کوێربێت من توانای ئەوەم نەبوو، لەگەڵ ئەوەشی لە تاقیکردنەوەی زانکۆدانمرەیەکی باشم هێنا، نەمتوانی بخوێنم، بەو هۆیەوە زۆر ئازارم چەشت خۆم لەناوبرد بەڵام بەخەیاڵی کێدا دەهات؟! ئەوە لەخێزانەکەم کەتوانایان نەبوو! کەسێکی بێگانەش لەبەرچی هاوکاری منی بکردایە؟!

بەڵام هەموو شتێك لەئەنجامی سەرکەوتنم لەتاقیکردنەوەی فەرمانبەریداو دامەزراندنم بەفەرمانبەر لەیەکێك لەزانکۆکانی ئێستانبوڵدا دەستی پێ کرد.

بەدەستبەکاربوونم لەبەشی تایبەتی بەڕێوەبەرایەتی ژیانم گۆڕا.

منێکی بەستەزمان کەجێی بایەخی کەس نەبووم، لەکاتێکدا کەبە چاوێکی کەم سەیر دەکرامو بچووك دەکرامەوە لەناکاو لەنێو پرۆفیسۆرو دکتۆرو جەوێك کەسیاسیەتمەدارەکانیش پێیان قورس بوو خۆم بینیەوە.

لەتەمەنمدا ئەوە یەکەمجارم بوو لەشوێنێکی وا ڕاقیدا دەمامەوە، کاتێك کە سەر ئەو ئۆتومبێلە لوکسانە دەبووم هەستەکانم بەتەواوی تێکەڵ دەبوون.

جوانکاریم بۆ ڕووتم کردو دەستم کرد بەدەستکاری کردنی قژو ماکیاژم دەکردو کەمێکیش جلی ڕووتم لەبەر دەکرد.

چیتر لەبەرئەوەی کچێکی جوانو سەرنج ڕاکێش بووم وردەوردە سەرنجی هەمووانم بەلای خۆمدا ڕاکێشا.

کاتێك لەگەڵ کەسانی پلەبەرزدا قسەم دەکردو دەبوومە جێی سەرنجیان زۆر دڵخۆشدەبووم.

ڕێزگرتنی ئەوان لە من و گۆڕینی ئاراستەیان بۆم لەبەر جوانیەکەم هۆشو بیری لەبەر هەڵگرتبووم.

ئەو ژیانە تازەیە بەئەندازەی سەرئێشە ناسروشتی بوو بۆکچێك کە بەدرێژایی تەمەنی پشت گوێ خرابوو و بەهۆی ناشیرینییەوە گاڵتەی پێ کرابوو، ئەوە شتێکی باوەڕ پێ نەکراو بوو، من خەریك بووم ژیانێك دەژیام کەسالآنێك بوو خەونەکانمیان ڕازاندبووەوەو لەخەیاڵم دەرنەدەچوون، دونیایەکی زۆر جیاوازتر لەدونیاکەی خۆم..

ڕێگایەکی بێ سنوور لەپێشمدا کرابوویەوەو منیش زۆر بێ پەروایانە خۆم دابوویە دەستی وەك ئەوەی بمەوێت تۆڵەی ساڵەکانی ڕابردووم بکەمەوە.

گوێم بۆ ئامۆژگارییەکانی دایكو باوکم نەدەگرت لەکاتێکدا ئەوان هەستیان بەو گۆڕانکارییانەی من کردبوو، خۆم دابوویە دەست ئەو دونیا ئەفسووناوییەو گوێم بۆ کەس نەدەگرت، دەمویست خۆم ئیسپات بکەم لەبەرچاوی ئەوانەی کەمنیان بە کەمو ناشیرین دەبینیو، دەمویست تۆڵەیان لێ بکەمەوە.

ئەوەندە خۆم لا گەورەببوو کە دەموت: "من هەم فەرمانبەرم هەم لەپلەیەکدام کە شایەنی هەڵسوکەوتی کەسە پایە بەرزەکانم" تەنانەت لەکاتی ڕۆیشتنیشدا بە لەخۆباییبوونەوە هەنگاوم دەناو ئەو ساڵەم بەلووت بەرزییەوە بەسەربرد.

دوای ساڵانێك لە برسێتیو بێچارەییلەخزمێکی دوورمانەوە میراتیەك بۆ خێزانەکەمان مایەوە.

خێزانەکەم بێئەندازە دەوڵەمەندبوون، بوونە خاوەنی ئەو موڵکە.. من چیتر کچێکی جوانی ناو خێزانێکی دەوڵەمەندبووم، ئەو ڕووداوانە بەتەواوی مێشکیان ئابلۆقەدابووم، بەڵام بێ هەواڵ لەو تەڵانەی کە چاوەڕێیان دەکردم.

لەساڵی پێنجەمی فەرمانبەرێتیمدا گەنجێکم بەناوی (چاداش)ەوە ناسی، لەگەڵ ئەوەشی بیروبۆچوونمان نێوانی ئەرزو ئاسمان جیاوازی هەبوو، بەڵام بەهۆی ئەو هەستانەی کە مەنتقیان بێ دەنگ کردبووم وام دەزانی خۆشم دەوێت، یان ڕاست بڵێم بەقسەکانیو یاری کردنی

بەوشەکان هەڵخەڵەتام، من بەخەیاڵی ئەوەی کەکچێکم شایەنی ئەوەم تاج بکرێتە سەرم لەناکاو خۆم لەناو یەك دونیا هەڵەدا بینییەوە.

لەگەڵ ئەوەی خاوەنی دوو دونیای زۆر جیاواز بووین، شتێکی ئاسان نەبوو ئەو جیاوازییانە لەیەك شوێندا یەك بگرنەوە باوەڕناکەم کەمن چۆن عاشقی کەسێکی وابووم!

بەلام من لەکوێ بمزانیایە کە کەوتومەتە ناو یارییەکی وەستایانەوە؟

لەکاتێکدا خێزانەکەی من خەڵکی گوندو ئیماندار بوون، بەلام خێزانەکەی ئەو هیچ هەستیارییەکان بۆ دین نەبوو، خۆیشی کەسێکی سەردەمی بوو نەیدەشاردەوە کەمولحیدە، بەردەوام خەریکی خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانەبوو. منیش ئەگەر چی ئەرکە ئاینیەکانم ئەنجام نەدەدا، بەلام ڕێزی تایبەتیم بۆ دین‌و مەعنەویات هەبوو.

بەڕواڵەت کەوتبومە ناو ژیانێکەوە کەژیان تیایدا مەحاڵ بوو.

بەلام بەهۆی شیرینی وەسف‌و سەناکانیەوە بۆم چاوم هیچی تری نەدەبینی.

بەردەوام دووبارەی دەکردەوە کە "زۆری خۆش دەوێم‌و من چارەنووسی ئەوم" و لەناو هەدیەو سوپرایزدا نوقمی کردبووم.

هەندێك لەدۆستەكانم كەئاگاداری ڕابردووی چاداش بوون داوایان لێ دەكردم كە "زیاتر ئاگاداری خۆم بم".

بەڵام من گوێم بەهیچ كام لەو ئامۆژگاریانە نەدەدا.

دەیوت: "خۆشەویستی وەك گوڵچانە سیحرییەكە وایە، چارەسەری هەموو كێشەكان دەكات."

من باوەڕم بەو ڕستەیە كردبوو كە زۆرجار دووبارەی دەكردەوە، چونكە لەوەوپێش هیچ كات ڕووخساری درۆزنو دووڕووم نەدیبوو.

لەوە زیاتر بەرەنگاری داواكاریەكانی ئەوم نەكرد، بەخۆمم وت "هەرچۆن بێت ئێمە زەماوەند دەكەین."

بەوشێوەیە گەورەترین هەڵەی ژیانم ئەنجامدا.

كاتێك كار هاتە سەر زەماوەند! وتی: "من بەڵێنی ئەوەم پێ نەداویت! هەموو شتێك بەڕەزامەندی خۆت بووە"...

لەوساتەدا دونیا بەسەرمدا ڕووخا، مردنم بەچاوی خۆم بینی ئەوكاتە تێگەیشتم كە بوون بەئەسیری هەستو سۆز بەسەر خۆشی گەنجێتییەوە چەندە هەڵەیەكی گەورەیە، لەدەمارەكانمدا هەستم بەوە دەكرد كەهەڵەیەك دەتوانێت تەمەنێك بكاتە دۆزەخ.

چەندین مانگ تێپەڕیو من بەگریانەوە ڕۆژم دەكردەوە خۆم حوكمدا بەوئاگرەی كەبەهەڵەی خۆم هەڵم گیرساند.

نەمدەویست باوەڕ بەو چیرۆکە بکەم کەهەر لەسەرەتاوە کۆتاییەکەی دیاربوو، تێگەیشتم کەئەو دۆستانەی ئاگاداریان دەکردمەوە چەندە لەسەر حەق بوون، بەڵام چیتر کار لەکار ترازابوو.

بۆکەسم ڕوون نەکردەوە کەمن هەڵەیەکی لەو جۆرەم کردووە بەبەردەوامی فرمێسکم دەڕشتو دەموت "خوایە گیان، بەم گوناهەوە بۆلای خۆتم مەبەرەوە، یان لێم خۆش بە یاخود لەگەڵ ئەو هاوسەرگیریم پیێ ببەخشە.ڕێگەمەدە بەم لەکەیەوە بگەڕێمەوە بۆلات، من ناتوانم بەم شێوەیە لەبەردەمتدا بوەستم."

چەندجار کەوتمە سەر ئەژنۆ، لێی پاڕامەوە چوومە لای دایکیو کەوتم بەسەر دەستو قاچیدا، کاتێکیش نەمتوانی ڕازییان بکەم، بۆئەوەی لەوە زیاتر سووك نەبمو ئازار نەچێژم هەوڵی خۆکوشتنم دا، بەڵام پەروەردگارم ڕێگەی بەوەنەدا.

هەرچۆنێك بێت لەدواییدا دایکی ڕەحمی جوڵاو ڕازی بوو بەهاوسەرگیریمان، ڕەنگیشە لەبەرئەوە بووبێت کە دایکی دەیزانی من کەسێکم دەتوانم خزمەتی کوڕە بێکارو لووت بەرزەکەی بکەم، لەبەرئەوە هاوکاریی کردین، بەڵام کابرا منی وەك خاتوونێك نا بەڵکو وەك خزمەتکارێك دەبینی، لەبەرئەوەی چارەیەکی ترم نەبوو ناچاربووم بەهەموو شتێك ڕازی بم.

ویژدانم ئەگەرچی کەمیش بێت هێور بووبوویەوە، لەدوای ئەوەی کەهاوسەرگیریم لەگەڵ ئەو کرد حیجابم پۆشی کەساڵانێك بوو دەمویست، بەڵام نەمدەتوانی بەسەر نەفسمدا زاڵ ببم لەسەرەتاوە هاوسەرەکەمو خێزانەکەی زۆر دژایەتیان کردم، بەڵام چیتر هیچ کام لەوانە بۆم گرنگ نەبوون.

لەیەکەم ڕۆژەکانی باڵاپۆشیمدا ئەوانەی ناو زانکۆ زۆر سەریان سوڕمابوو یەکسەر دەستیان کرد بەپشت گوێ خستنم، چیتر گوێیشم لەو پیاهەڵدانانە نەبوو کە پێی ڕاهاتبووم، لەبەرئەوەی وەڵامی سەرنجەکانیانم نەدەدایەوە تەنانەت جاری واهەبوو ئازاریشیان دەدام بەقسەکانیان.

لەساڵی یەکەمی هاوسەرگیرییەکەماندا کچەکەم لەدایك بوو، هاوسەرەکەم لەوەدا نەبوو کە بەرپرسیارێتی ئێمە هەڵبگرێت، ئەسڵەن خاوەنی کاراکتەرێکی وانەبوو، پێش منیش چەندین کچی چارەڕەش کردبووو وازی لێ هێنابوون.

لەکاتێدا کەهاوسەرگیری لەگەڵ منداکردبوو، بێ شەرمانە لەگەڵ کچاندا دەچووە باخچەوکافتریاکانەوە، تەنانەت یەکێك لەو کچانە کارەکەی زۆر زیاتر هێنابووە پێش، لەتەلەفۆنەکەیدا نامەکانی کچەکەم بینی، کاتێکیش سەبارەت بەوە قسەم لەگەڵ کرد، پێی وتم: "کەئەو کچە وەك من یەکسەر خۆی نەداوە بەدەستەوە، لەبەرئەوەیە

منی خۆش ناوێتو حەیرانی ئـەوە" وتیشـی:"منداڵەکـەم لەکەسـێکی ترە".

من دەمتوانی چی بڵـێم؟ ئەگـەر لـەڕووی ئـەوەوە سـەیربکرێت مـن هیچم بۆ وتن نەبوو، بەڵام من لەباوەشمدا منداڵێك هـەبوو، لەبەرئـەوە ناچاربووم خۆم بخۆمەوەو بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکـەم وەك ئـەوەی هیچ ڕووی نەدابێت.

وام بیردەکردەوە کەئەمانە ئەنجامی ئەو هەڵانەن کەئەنجاممداون و هەرچییەکم بەسەر بێت با بێت، من شایەنی ئەوەم.

هاوسەرەکەم بەتێپەڕبوونی کـات زیـاتر پەرتـەوازە دەبـوو وای لـێ هاتبوو نەدەگەڕایەوە بۆماڵەوە.

حاڵەتی دەروونی بەتەواوی تێکچووبوو، بـەجۆرێك هـەموو شـتێکی بەئاشـکرا دەکـردو هـەر ڕۆژەی لەئاسایشـێکەوە هـەواڵی ڕووداوێـك دەهاتەوە.

بەردەوام دەیوت کەمن ئەوم فریوداوەو ئـەو منداڵـەش لەکەسـێکی دیکەیە، خراپیەکەی ئەوە بوو کەخێزانەکەشی باوەڕییـان بـەدرۆکانی کردبوو، دەیانوت:

–کوڕەکەی ئێمە زۆرباش بوو، هەموو ئەمانە بەهۆی تۆوە ڕوویانـداو، هەموو تاوانەکەیان دەخستە ئەستۆی من.

بەڵام خواناگادارە من بێ تاوان بووم، لەژیانی مندا نەلەپێش ئەوو نەلەدوای ئەوەوە هیچ کەسێکی دیکە بوونی نەبوو، من کەسێکی وانەبووم، ئەو لەلایەکیشەوە لەسەرحەق بوو چونکە لەچاوی خۆیەوە دەیڕوانی.

من چۆن بمزانیبایە؟! هۆکاری ئەوەبوو کەمن لەسەرەتاوە ئەو هەڵەیەم کردبوو، من نەدەبوو خیانەت لەئەمانەتی پەروەردگارو ناموسم بکەمو بڵێم: "هەرچی بێت هاوسەرگیری دەکەین".

هاوسەرەکەم کاری نەدەکرد، بەردەوام بەدوای کچی ترەوەبوو، بۆئەوەی هاوسەرگیرییەکەمان تێك نەچێت، دووبارە خاوەنداریێتیم دەکردو پارەم پێ دەدا.

ئەو هیچ کات نەدەچووە ژێر فەرمانی کەسەوەو بەردەوام شەڕی دەکرد چیتر وەك نەخۆشی لێ هاتبوو، کاتێ سەردانی دکتۆری کرد بوو، دکتۆر وتبووی کەتووشی نەخۆشی (شیزۆفرنیا) بووە، بەتێپەڕبوونی کات شتەکان زیاتر ئاڵۆز بوون.

ڕۆژێك درەنگانێك گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، وتی کە من خیانەتم لێ کردووەو لەبەرئەوە دەیەوێت بمکوژێتو ناموسی خۆی پاك بکاتەوە، نەمتوانی هەڵبێم، بەزۆر بەستمیەوە بەقەنەفەکەوە.

چەقۆیەکی گرت بەدەستییەوەو سوێندی خوارد کەسەرەتا منو پاشان خۆشی دەکوژێت، زۆر بێ ویژدانانە دەستی کرد بە چەقۆ

وەشاندن لێم، لەوکاتە ترسناکەدا، کەس گوێی لەهاوارو ناڵەکانم نەبوو، یاخود گوێیان لێبوو بەڵام نەیانویست بێن.

چەقۆکە دووبارەو سێ بارە دەچووە جەستەمو دەردەهاتەوە، من باجی ئەو هەڵە قێزەونەم بە لەت لەت کردنی جەستەم دەدایەوە.

لەکاتێکدا کەلەبەردەمی ئەو قەسابەدا گۆشتی لاشەم پارچە پارچە دەبوو، هەستم دەکرد کە ڕۆحم سووك دەبوو گوناهەکانم هەڵدەوەرین.

ئەوەی کەسەیر بوو ئەوەبوو کەمن لەبەردەم ئەو هەموو جوێنو شەقو چەقۆ وەشاندنەدا تەنها بیرم لەمنداڵەکەم دەکردەوە، بۆیە هاوارم دەکرد، ئەگەر نائازارم نەدەچەشت وەك ئەوەی لاشەم بەنج کرابێت، هەستم بەهیچ نەدەکرد ، خوای گەورە سزای ئەو گوناهە گەورەیەی لەدونیادا لێ سەندمەوە، یاخود من باوەڕم بەوە هێنابوو.

نەمدەزانی لەو بازاڕی لاشەیەدا چەند شەقو تێهەڵدانو چەند چەقۆم بەرکەوت، کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم بینیم لە بەشێکی چاودێری نەخۆشخانەیەکدا بووم.

کەسم لەدەور نەبوو، بەهۆی ئەوەی حەرامێکم ئەنجامدا کە پەروەردگارم قەدەغەی کردبوو، بەبیرکردنەوە لەوشتانەی کەلەم دونیایەدا بەسەرمدا دەهاتن و، تەنانەت بیرکردنەوەش لە بەشێکی سزای دواڕۆژ لەرزی دەخستە گیانم.

دایكو باوكم لەبەر ئەوەی بەو هاوسەرگیرییە ڕازی نەبوون، دڵیان لێم ئێشابوو، خێزانی هاوسەرەكەشم خواخوایان بوو بمخنكێنن ئەگەرچی لەكەوچكە ئاوێكیشدا بێت، هاوسەرەكەشم خەریك بوو بمكوژێت بەڵام خوای گەورە ڕێی پێ نەدا ئەوەتا ئێستاش بەتەنیا لەگەڵ منداڵەكەمدا ماومەتەوە.

كاتێك كە چاك بوومەوەو گەڕامەوە سەركار لەڕاستیدا سوپرایزی ڕاستەقینە لەو كاتەوە دەستی پێكرد، هاوسەرەكەم لەلای دەستەی بەڕێوەبەرایەتی ژمارەیەك درۆو قسەی هەڵەی بۆهەڵبەستبووم كە گوایە من ئەوم هەڵخەڵەتاندووە، دەستەی بەڕێوەبەرایەتیش خۆیان بەدوای بیانوویەكدا دەگەڕان لەبەرئەوەی بووبووم بە باڵاپۆش منیان نەدەویست، بەو شێوەیە ئەوەیان بەفرسەت زانیو دەستیان كرد بەلێپرسینەوەمو لەكارەكەم دووریان خستمەوە.

لەگەڵ منداڵێكداو لەماڵێكی دوو ژووری كرێدا وەك قوربانی باجی هەڵەكانم دەدایەوە، ڕێك لەكاتێكدا كەخەریك بوو شێت دەبووم كتێبەكانی جەنابتان گەیشتنە فریام.

من خۆمو هەڵەو تاوانەكانم لەكتێبەكانی "ئایسێل، جانان، من لەئاگردا سەوز بووم، هەروەها كۆتا هەناسە لەسوجدەدا" دۆزییەوە.

زۆر ماندوو بووم، هەست دەکەم زۆر تەنیام، لەخودا دەپاڕێمەوە کەسێکی خاوەن تەقوای ڕاستەقینە بەرەو ڕووم بنێرێت کەبتوانێت هاوکاریم بکات.

لەدوای هەموو ئەو هەڵانەی کە ئەنجامم داون، ڕێگا چارەیەکی دی شك نابەم، سوێندم خواردووە کە لەژیانمدا بەندەیەکی باش بم بۆخوداو شایەنی ئەوە بم کە لە ڕیزی ئوممەتی محمد ﷺدا ببم‌و قوتابییەکی شایستە بەقورئانی پیرۆز بم.

ئێمە لەدونیای تاقیکردنەوەداین.

من لەمنداڵیمەوە هەمیشە لەگەڕاندا بووم، ژیان‌و بوونی ئێمە پێویست بوو لەبەر هۆکارێك بێت! نەدەکرا لەم دونیایەدا بژین‌و دواتر بمرین! پێویست بوو ئامانجێك لەگۆڕێدا هەبێت، لەسەرەتادا دەستم دابوویە کتێبەکانی فەلسەفە، بەڵام ئەو کتێبانە منیان فرێ دایە ناو بیرۆکەی ئەوەی ژیان لەم دونیا بێ بایەخەدا بێ مانایە، بەئەندازەی خۆکوشتن منیان ڕاپێچ بەتێکدانی بیروهۆش کرد.

لەدوای دەرچوون لەتاقیکردنەوەی فەرمانبەرییدا دەستم کرد بە ژیانێکی تازە کەبە خەونیش نەمدیبوو، ئەوەندەش جوان بووم کە سەرنجی هەموانم ڕاکێشابوو پیایاندا هەڵدەدام.

ئەمە تاقیکردنەوەیەکی باوەڕ پێنەکراو بوو، بوومە کەسێکی خراپ، منیش کەسانی ترم بەکەم دەبینی غرور گرتمی دڵی کەسانێکم

شکاندو ئەوەندەی لەتوانامدا هەبوو ستەمم کرد هەموو ڕۆژێکم پڕ بوولە گوناه، بەڵام دواتر بەناموسم تاقیکرامەوەو لەگەڵ (چاداش) دا ئەو تاقیکردنەوەیەم دۆڕاند.

دەبوو لەم دونیایەدا باجێك هەبێت بۆهەموو ئەو هەڵانە.

لەبەر کەمو کورتییەکی فیزیایی کەخودا پێی بەخشی بووم، نەمتوانی باوەڕ بەمێردەکەم بهێنم کە بەرلە ناسینی ئەو هیچ کەسێکی تر لەژیانمدا نەبووە، تەنها منو خودا دەزانین، بەڵام نەمتوانی ئەوەی بۆبسەلمێنم چەندەها ڕۆژ نارەزاییم دەربڕی "کەبۆچی لەو هەموو ئافرەتەدا من؟"

لەبەر ئەو هۆکارەش بوو هاوسەرەکەم هەمیشە گومانی لێم هەبوو، چونکە نەمدەتوانی بەرگری لەخۆم بکەمو باوەڕی بێ بهێنم، هەرچی بوتایە ملم کەچ دەکردو چەندی لێ بدامایە دەنگم لێوە نەدەهات، پەروەردگارم هەر لە دونیادا لەسەر تاوانەکانم سزای دام.

هیچ کات لەپاڕانەوە لە خوداو داوای هاوکاری لێی پاشگەز نەدەبوومەوە... دەپاڕامەوە:

"پەروەدگارم، تکایە هاوکاریم بکە، ڕێنیشاندەرێکی تەواوم بۆبنێرە تامن لەم حاڵەم ڕزگار بکات، کەسێکم پێ بناسێنە کە سوودی لێ ببینمو چاو لەئیمانی ڕاستەقینەی ئەو بکەمو منیش هەوڵی بۆبدەم."

کاتێك بەڕێگادادەڕۆم ئەو گەنجە پـاكو خاوێنانـە دەبیـنم، خۆزگـە دەزانن چەندە ئێرەیی بەو كچە باڵاپۆشانە دەبەم كە چـاویان لەسـەر زەوی بەرز ناكەنەوە.

بەخۆم دەڵێم: "خۆزگە منیش وەك ئەوان بەندەیەكی پاكو خـاوێن بوومایە، خۆزگە بەتەوەكولێكی بێ سنوورەوە بمتوانیایە تەنها لەبـەر ڕەزامەندی خوا بژیم."

لـەدوای خوێندنـەوەی كتێبـەكانتان، تروسـكایی ئومێـد لەناخمـدا سەری هەڵدا.

"كەواتە هێشتا كەساني خاوەن ئیمـانی ڕاسـتەقینە بوونیـان هەیـە ئەگــەر زۆر خوازیــاریمو بمــەوێت ڕەنگــە پــەروەردگارم مــن بــەوان بناسێنێت."

دەمەوێت ئێوە ببینم، یاخود هـیچ نـەبێت، ئاشـنایەتی لەگـەڵ ئـەو ئیمانداره ڕاستەقینانە پەیدا بكەم، ئێوە دەتوانن هاوكاریم بكەن؟

من تكاتان لێ دەكەم دەسـتی ئـەم كچـەتان بگـرن كـەژیانی لـەنێو بەندایەتی هەستەكانی گەنجێتیدا بـەگوناه بەسـەر بـردووەو ئێسـتاش ئــازاری ویــژدان دەچــێژێت، هــیچ نــەبێت ئــەو تەمەنــەی كەماومــە بەشێوەیەك بەسەر ببەم كەشایەنی بەدیهێنەربێت.

هاوكاریم بكەن تا ئەوانەی كە دواتر دێن، سەیری حاڵی من بكـەنو پەنــدوەربگرن، تــا گــەنجێتییان لەســنووری ئیمــانو پــاك داوێنیــدا

بەسەربەرن، ئەگەرنا گوناهێکی یەك ساتیی لەتوانایدا هەیە تەمەنێك لەناو ببات‌و ژیانێکی دۆزەخی بەمرۆڤ ببەخشێت، هیچ کەس لەمن باشتر لەوە تێ ناگات.

ئەمەش وەسیەتی منە..

تکایە من لەبیر مەکەن...

(ناوەکەی پارێزراوە)



# ئێمە نرخمان نەزانیوە

مامۆستای بەڕێزم کاک خالید؛

پێش هەمووشتێك لەبەرئەوەی عەزیەتی خوێندنەوەی نامەکەمتان کێشاوە، خوازیارم پەروەردگارم لێتان ڕازی بێت.

مامۆستای ڕێزدارم هۆکاری نووسینی ئەم نامەیەم، دەگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەی یەکێك لەبەرهەمەکانتان بەناوی (محمدی دوزجەیی)، لەبەرئەوەی بەرهەمێکی لەوشێوەیەتان نووسیوە خوای گەورە دووبارەلێتان ڕازی بێت. بەسەرهاتی پڕپەندی محمدی دوزجەیی و ڕووداوە سەیرەکانی ژیانی ئەو لاوە زۆرکاری تێ کردم و بەفرمێسکەوە کتێبەکەتانم خوێندەوە. من بەرهەمەکانی ئێوە بۆ ئێمەی گەنجان بە نیعمەتێکی زۆر گەورە دەبینم، چونکە لەدەوروبەرماندا گەنجانێکی

زۆری وەك محمدی دوزجەیی هەن كەمن باوەڕم وایە ئەم جۆرە بەرهەمانە دەتوانن سوود بەو گەنجانە بگەیەنن‌و ببنە هۆكاری هیدایەت بۆیان.

هەروەها وابیر دەكەمەوە كە منیش شتانێك لەو بەرهەمانەی ئێوەوە فێربووم، من تەمەنم ٢١ ساڵەو قوتابی قۆناغی سێی زانكۆم سوپاس بۆخودا باوەڕم بەخودا هەیە، بەڵام لەهەندێك بابەتدا زانیاریم كەمە.

لەمنداڵیمەوە مامۆستا سەعیدی نوورسی دەناسم كەئێوە لە بەرهەمەكانتاندا باستان كردووەو خاوەنی (پەیامەكانی نوور)ە كە بووە هۆی هیدایەتی محمدی دوزجەیی.

باوكم كەسێكە كەماوەی ٢٠ ساڵە (پەیامەكانی نوور) دەخوێنێتەوە ئەویش لەدواییدا ناسیویەتی، باوەڕ بكەن لەگوێ گرتن لەقسەكانی باوكم تێر ناخۆیت ئەگەر گوێی لێ بگریت، هەمیشە هاوكارم بووە، بەڵام زۆریش حەز بەگوێ گرتن لە وتارەكانی ئێوە دەكەم.

لەسایەی كتێبەكانی ئێوەوە هەستم بە كەم‌و كورتییەكی گەورەی خۆم كرد، سەرەڕای ئەوەی لەماڵەكەمدا (پەیامەكانی نوور) بوونیان هەیە كەچی نایانخوێنمەوە.

لەدوای خوێندنەوەی كتێبەكانتان، ئەم هەستانەم لای زۆر كەس باس كردووە، لەسەرەتادا لەگەڵ باوكمدا لەم بارەیەوە قسەم كرد،

پێموت کەکتێبەکەی ئێوەم خوێندووەتەوەو پێویستە بەهەر نرخێك بێت ئەویش بیخوێنێتەوە، زۆر بەغەمبارییەوە ئەوەشم زیاد کرد بۆقسەکانم:

"من لەناو چ نیعمەت گەلێکدابووم‌و قیمەتیم نەزانیوە."

مامۆستا من نەمتوانی قیمەتی ئەو کتێبە بەنرخانە بزانم.

بەئیزنی خودا لەمەودوا قیمەتیان دەزانم، یەکێك لە گەورەترین ئارەزووەکانم ئەوەیە کە لەڕێگای خوادا خزمەت بکەم، هیوادارم (پەیامەکانی نوور)و مامۆستای بەڕێزی وەك ئێوە هاوکاریم بکەن.

مامۆستا تکایە دوعام بۆبکەن، إن شاءالله منیش وەك ئێوە ببمە مامۆستا، گەورەترین ئارەزووم بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارە، لەبەرئەوە دەمەوێت هەرچی لەدەستم بێت بیکەم بۆئەو مەبەستە.

مامۆستا،ئامانجی من بەدڵنیاییەوە پەیداکردنی پارەنییە! بەڵکو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە، لەهەر کارێکدا کە ئەنجامی دەدەم ڕەزامەندی ئەو زاتە هەموو خواست و ویستێکی منە، خۆشەویستی بۆئەو زاتە دەرنابڕدرێت، بەڵکو پەیڕەوی بەرنامەکەی دەکرێت، ئێوە ئەمە لەهەرکەس باشتر دەزانن. مامۆستا گیان، هیوادارم بێزارم نەکردبێتن، باوەڕ بکەن زۆر دڵخۆش دەبم ئەگەر بزانم

ئـەم نامەیـەمتان خوێندووەتـەوە، لەبەرئـەوەش چـەندە سوپاسـتان بکەم کەمە.

مــــن بــــەردەوام دەبم لەخوێندنــــەوەی بەرهەمــــەکانتان‌و بەهاوڕێکانمیشـیان دەناسـێنم، بەڕاسـتی بەسـەرهاتەکانی محەمـەدی دورزجـەیی ڕووداوگـەلێکن کـە نـاخ دەهـەژێنن، بەتایبـەتیش هـاتنی سەعیدی نوورسی بۆ نەخۆشخانە بـۆلای محمـدو ئـەو ڕووداوانـەی کـە لەنوێژی هەینیدا ڕوویان دابوو زۆر کاریـان تێکـردم، هـەروەها مردنـی محمد لەکاتی نوێژدا بووە هۆی فرمێسك ڕشتنم، خوێندنەوەی پـەیامی "حەشر"یش زۆر پڕ نهێنی بوو.

پەروەردگارم لەئێوە ڕازی بێت کە بوونە هۆکاری هیدایەتی محمـدو لەو زۆنگاوەڕزگارتـان کـرد، چـەند مایـەی شـانازییە کەمامۆسـتایەکی وەك ئێوەمان هەیە.

مامۆستا، کەسانێکی زۆری وەك محمد هـەن، إن شـاءالله ئـەوانیش لەسایەی هاوکاری بەرهەمەکانی ئێوەوە دێنە سەر ڕێی ڕاست.

مامۆستا زۆر حەزم دەکرد لەخەونمدا محمد ببیـنم‌و قسـەی لەگـەڵ بکـەم ئـەو قسـەیەی ئێـوەم زۆر بەدڵـە کـەوتبووتان: "مـن چـیتر مامۆستای محمد نیم، بەڵکو ئەو مامۆستای منە." ئەو خاکی بوونـەی ئێوە زۆر کاری تێکردم.

هیوای سەرکەوتنی بەردەوامتان بۆ دەخوازم، بەهیوای ئەوەی لەورێییەدا سوود بەزۆر کەس بگەیەنن.

دووبارە داوای ڕەزامەندی خواتان بۆدەکەم کە بێزاربوون گوێتان بۆ گرتم، داواکارییەکم لێتان هەیە، حەز دەکەم هەستی ئێوە بەرامبەر نامەکەم بزانم، هیوادارم داواکەم بێ ڕێزی نەبێت بەرامبەرتان.

هەروەها نامەوێت لەمەودوا پەیوەندیم لەگەڵ ئێوە بپچرێت، چونکە زۆر شت هەیە کە دەمەوێت لەکەسێکی بەڕێزی وەك ئێوەوە فێری ببم.

سڵاو و ڕێزم قبوڵ بکەن...

بەخواتان دەسپێرم...

(ناوەکەی پارێزراوە)



# هەرکەسێك دوعای دایكو باوکی بیگرێتەوە سەرکەوتوو دەبێت

سەعیدی گەنج کە تازە پێی نابوویە ١٨ ساڵییەوە، بەبانگهێشتی والی (وان) لە (بەتلیس)ەوە کەوتەڕێ، بەڵام بێ هەواڵ بوو لەو سوپرایزانەی کەچاوەڕێیان دەکرد.

وەك میوانی والی لەدوای ماوەیەکی کەم لەگەیشتنی بۆ (وان) ناوو ناوبانگی بەهەموو لایەکدا بڵاو بوویەوە، ئەو زیرەکییە وەك بلێسەی بەهرە زانستیو دینییەکانی بووبووە مایەی باسو خواس لەهەموو لایەك.

حەسەن پاشای والی کە ڕێزێکی زۆری لەسەعید دەگرت، میوانخانەکەی وەك مەرکەزێکی کلتووری لێ کردبوو خستبویە ژێر فەرمانی سەعیدی گەنجەوە.

هەموو ئێوارەیەك زانا بەناوبانگەکانی کۆدەکردەوەو موناقەشەی دینیو زانستی لەنێوانیاندا ڕێك دەخست، بێگومان وەك هەمیشە کەس نەیدەتوانی پێشی سەعیدی گەنج بداتەوە.

سەعیدی گەنج لەو ماوەیەدا کەلەمیوانخانەکەی (والی)دا دەمایەوە، لەپاڵ زانیارییە ئایینییەکاندا شارەزاییەکانی لە بوارە زانستی و کۆمەڵایەتیەکانیشدا چڕتر کردەوە. بەتایبەتیش لەبواری زانستەکانیوەك مێژوو، جوگرافیا، فیزیا، کیمیا، بیرکاری، شارەزاییەکی قووڵی پەیداکرد.

بەشێوەیەك ئەگەر کەسێکی شارەزا لەبواری زانستیو کۆمەڵایەتیدا بهاتایە، سەعید وەك پرۆفیسۆرێك کە لەو بوارەدا تەمەنی بەسەر بردبێت دەکەوتە مشتومڕو هەمووانی تووشی سەرسوڕمان دەکرد.

بەتایبەتیش لەو ڕۆژانەدا ئەو گفتوگۆیەی لەنێوان ئەو و مامۆستایەکی جوگرافیادا ڕووی دابوو، بووبووە داستانی سەر زمانی هەمووان. مامۆستایەکی جوگرافیا چەند پرسیارێکی لەسەعیدی گەنج کردبوو، سەعیدیش پێی وابوو کە لەو بوارەدا شارەزایی تەواوی نییە بۆیە وەڵامی نەدابوویەوە.

بەڵام بۆ ڕۆژی دواتر کتێبێکی جوگرافیای لەبەر کردبوو و چووبووە خزمەتی مامۆستاکە، لەدوای تەواوبوونی گفتوگۆکە مامۆستاکە دەستی سەعیدی ماچ کردبوو وتبووی:

-خودا تەمەنێکی پڕ خێرو درێژت پێ ببەخشتێت.

هەروەها جارێك بۆموناقەشەکردن لەگەڵ مامۆستایەکی کیمیادا لەچەند ڕۆژێکدا کتێبی کیمیای خوێندبوویەوەو وردترین زانیاری لێ وەرگرتبوو مامۆستاکەش لەو ئێوارانەدا گەورەترین وانەی ژیان فێر بووبوو.

جیالەوەش لەبواری بیرکاری‌و مەنتیقدا دا بەتەواوەتی بلیمەت بووە، لەکاتێکدا هەموان چەندین کاغەزو قەڵەمیان بەکارهێناوە تا هاوکێشەیەکی بیرکاری شی بکەنەوە، بەڵام ئەو لەمێشکی خۆیداو لە ماوەی پێنج بۆ دە چرکەدا هاوکێشەکەی حەل کردووە.

سەعیدی گەنج لەکاتێکدا کە لە لوتکەی ناوبانگدابوو و لەلایەن خەڵکەوە خۆشویست بوو، لەو ڕۆژانەدا ڕووداوێکی لەبیرنەکراوی بۆهاتەپێش..

خزمەتکاری میوانخانەکەی والی هاتە ساڵۆنی میوانخانەکە کە سەعیدی لێبوو پێی وت:

-گەورەم، گوندنشینێك بەسواری گوێدرێژەکەیەوە هاتووەو لەبەردەم میوانخانەکەدا داوای بینینی ئێوە دەکات، من هەرچەندە

وتومە "نابێت" بەڵام ئەو سوورە لەسەر داواکەی، بیهێنمە ژوورەوە یاخود بەرێی بکەم بڕوات.

سەعیدی گەنج بەشەوق و هەیجانێکەوە بەرەو دەرەوە هەڵهات، کاتێك ئەو گوندنشینەی بینی کە زۆر بەریئانە لەگەڵ گوێدرێژەکەیدا لە گۆشەیەکدا دانیشتبوون، دەستەکانی گرتو وتی:

—باوکە!

چاوەکانی میرزا ئەفەندی لەناکاو گەشانەوە، کە چەند ڕۆژێك بوو ماندوو بوو بەهۆی ئەو ڕێگایەی کەبڕیبووی.

—کوڕەکەم، سەعیدەکەم!

لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر کوڕەکەی خۆی نەدیبوو، حەسرەتی ئەو جەرگی سوتاندبوو و، فرمێسك بە چاوەکانیداو دەهاتنە خوارەوە،باوكو کوڕ باوەشیان بەیەکدا کردو تا ماوەیەك بەو شێوەیە مانەوە.

لەسەر داوای نوورییە خاتوونی دایکی سەعید، میرزا ئەفەندی سەرەڕای زەحمەتییەکانی ئەو ڕۆژانە، کەوتبووە ڕێو تا شاری (وان) هاتبوو.

دایكو باوکی سەعید کاتێك گوێبیستی ڕووداوەکان دەبوون سەبارەت بەکوڕەکەیان هەندێك جار دڵخۆشو هەندێك جاریش خەم

دایدەگرتن، بەڵام کردەوەکانی کوڕەکەیان کەتازە خەریك بوو پێی دەنایە نۆزدەساڵییەوە هەمیشە جێی شانازیی بوو بۆیان.

میرزا ئەفەندی وتی:

—کوڕی خۆم! با کەس من نەناسێت، لەپەنایەکدا پێکەوە کەمێك دادەنیشین، هەر ئەوەندە بەسە، دواتر من میوانخانەیەك دەدۆزمەوەو شەو لەوێ دەخەوم، با بەم حاڵەمەوە نەزانن کەباوکی تۆم، تۆ میوانی والیت، لەگەڵ کەسانی گەورەدا هەڵدەستیتو دادەنیشیت، نامەوێت شەرمەزارت بکەم.

سەعدی گەنج بەو وتە میهرەبانانەی باوکی ئاگر لەجگەری بەربوو وتی:

—ئەوە چ قسەیەکە باوکە گیان! دووبارە خۆی دایەوە بەسەر دەستی باوکیداو وتی:

—تۆتاجی سەری منی، ئەگەر تۆ منت بەحەڵاڵی بەخێو نەکردایەو لەدوعای خێر بێ بەشت بکردمایە، من چۆن دەمتوانی ببمە میوانی والی؟

دەستی باوکی گرتو بردیە میوانخانەکە کەپڕ بوو لەمیوان کە لە(وان)ەوە هاتبوون و (والی)ش لەوێ بوو، بەدەنگێك کە هەموان بتوانن گوێبیستی ببن بە دڵخۆشییەکەوە وتی:

—ئەمە باوکی منە.

لەگـەڵ خـۆی بردییـە سـەرەوەو لەتەنیشـت (والی) دا داینیشـاند، خۆشی کەوتە سەر چۆك لەبەردەمیدا.

یەکێك لە خواناسەکان کەلە قەرەباڵغیەکەدابوو، زۆر دوور بوویـەوە لەمیرزا ئەفەندیو هەستی بەنووری دەمو چاوی کـرد لەبـەر خۆیـەوە وتی:

–باوکێکی وەها هەر کوڕێکی لەو شێوەیەی دەبێت، چەندە لەیـەك هاتوون!

باوکێـك کـەپارووی حـەڵاڵی بەمنداڵـەکانی دابێـت و، منـداڵێك کـە دوعای خێری باوکی بەدەست هێنابێت! دڵەکانیانتەنانەت بە تـۆپیش ناڕووخێت.

قسەی ئەو خواناسە بەڕاست گەڕا.

منداڵی خێزانێك کـە بـەپارووی حـەڵاڵ گۆشـکرابێت، بـەم شـێوەیە بەوەفادەبێتو دوعای خێری دایكو باوك دەیگرێتەوە.

لەبەرئەوەبوو کە بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی لـەلای هـەموان ناسرا...

بائەوە ببێتە وەسیەتێك بۆگەنجەکان...



# هەرکەس پشت بەخودا ببەستێت دەیباتەوەو ئەوەشی پشت بە بەندەکانی خودا ببەستێت لەناودەچێت

هـەموو ڕۆژێـك لـەڕۆژی پـێش خـۆی چـڕترو قـەرەباڵغترو دژوارتـر تێدەپەڕی، کۆنفراسەکان، ڕۆژی ئیمـزا، وانـەکانی زانکۆو بانگهێشـتە یـەك لـەدوای یەکـەکان لەلایـەن خۆشەویسـتانمانەوە جەسـتەمانی بەتەواوی مانـدوو کردبـوو، لەبـەر ئـەوەش تەندروسـتیم دەسـتی کـرد بەنیشاندانی هێمـای نەخۆشـی، زۆر بـە جـدی پێویسـتم بەچـاودێری و پشکنینێکی خێراهـەبوو. بـەوتنی: "ئـەمڕۆ مـەجالم نییـە، سبەی إن شـاءالله " " ئـەم مانگـە زۆر سـەرقاڵم إن شـاءالله مـانگی داهـاتوو "

"باپرۆگرامەکانی ئەم زستانەم کەمو کورتی نەنوێنن، هاوین إنشاء الله" ... بەتەواوی هێزو توانام لەبەربڕا.

مەگەر لەش ساغی چ نیعمەتێکی گەورەیە، چ دەوڵەمەندیەکە کە تالەدەست نەچێت قیمەتو بەهای نازانرێت.

خوا لەدۆستەکانم ڕازی بێت بردمیان بۆ نەخۆشخانەو پشکنینیان بۆکردم.

لەسایەی ئەو مرۆڤە ڕۆح سووکانەی دەروبەرمەوە، هەمووکارەکانم بەڕێكو پێکی دەڕۆیشتن بەڕێوە، هەروەها بەهۆی ئەو دۆستانەی کە خۆشیاندەویستم زۆر بەبێ زەحمەت چوومە ژێر پشکنینەوە.

لەکاتێکدا کەورد دەبوومەوە ئەو نەخۆشخانە گەورەیەو پلیکانەو نهۆمەکانی، گوندنیشنێکی داماو کەوتە بەرچاوم.

بەکاغەزەکانی دەستیەوەو بەشڵەژاوییەوە کە نەیدەزانی دەردی خۆی بەکێ بڵێتو چۆن بیلێت، زۆر بەغەمبارییەوە سەرنجەکانی تێ بڕیم وەك ئەوەی داوای هاوکاریم لێ بکات.

کاتێك ئەو قەرەباڵغیەی بینی لەدەوروبەرمدا دیاربوو ئێرەیی پێ دەبردمو لەناخەوە دەیوت: "ئاه خۆزگە منیش کەسێکم هەبوایە کەدەستم بگرێت!"

چەند جارێك لەناخمدا دەنگێك لەویژدانمەوە بەرزبوویەوەو پێی وتم:

"چی دەبێت ئەگەر هاوکارییەکی ئەو داماوەش بکەین!" بەلام فەرمانبەرەکانی نەخۆشخانە بەجۆرێك لەگەڵ ناڵەو هاواری نەخۆشەکاندارِاهاتبوون، ئەو ڕووداوانەی ناخی ئێمەیان پارچە پارچە دەکرد لای ئەوان شتێکی زۆر سروشتیو ئاسایی بوو.

کاتێك ئەو بەستەزمانەم بەکاغەزەکانی دەستییەوە بینی کەبەرەو خوارەوە دەهات لەناخی خۆمدا وتم: "ئەی هاوار، وابزانم ئەو داماوە لەبەرئەوەی نەیتوانی چارەیەك بدۆزێتەوە وازی هێنا! بێ چارە وا بزانم پەشیمان بوویەوەو دەڕواتەوە!"

وتم:

–مامە،کارەکانت بۆ سبەینێ دواخست!

–نەخێر قوربان، تەواو بوو سوپاس بۆخوا.

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم:

–واتە کارەکانت تەواو کردوو دەڕۆیتەوە؟

–بەڵێ قوربان، تەواومان کرد سوپاس بۆخوا.

سەیری ئەو کارە بکەن، من لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو دۆستەم لەدەوربوو هەمان ئیشو کارەکانی ئەوم لەڕۆژێکی تەواودا پێ تەواو نەکرا، کەچی گوندنیشنێکی بێ دەسەلات لەماوەی دووسێ کاتژمێردا کارەکانی تەواو کردو بەتەمای ڕۆیشتنەوەیە!

خۆم پێ نەگیراو پرسیم؟

–کەواتە تۆش واستەیەکی باشت هەیە؟

–بەڵێ قوربان.. واستەکەی من لەشوێنێکی زۆر گەورەیە.

–واستەکەت لە سەرۆکی پزیشکانەوەیە ؟

بەڵام ئەو دەستی بەرزکردەوەو وتی:

–مامۆستام! تۆ نازانی کە کەسی بێ کەسان پەروەردگارە!

سەیری ئەو کورت هێنانە بکەن سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەیەکێك لەدۆستانم وتی: "مامۆستاهیچ خەمتان نەبێت لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا پشکنینەکان تەواو دەبن."

دەتوت دەستێکی نەبینراو، کارەکانمان دوادەخات.

–مامۆستا سۆنەرەکەمان بەباشی نەگرتووە، دووبارە دەیگرینەوە، ئەو خوێنەی کە هاوڕێکەمان لێی وەرگرتبوون زایەبوو، پێویستە دووبارە خوێنتان لێ بگرینەوە.

مەکینەکە کارناکات، ئەمەشیان دووبارە دەکەینەوە..

ئەی بابە! وەك بڵێی ئەمڕۆ هەموو کەم و کورتییەکان بەدوای مندا دەگەڕێن، ئەو ئیشانەی کەدەیانوت لەدووسێ کاتژمێردا تەواوی دەکەین، وادیار بوو بەرۆژێك تەواو نەدەبوو لەناو ئەو هەموو دۆست و هاوکارەمدا تایبەتمەندیەکانم وەك دراماکی لێ هاتبوو، دەبێت حیکمەتێك لەمەدا هەبێت!

دووباره لەنێو نهۆمەکاندا لەکاتێکدا خەریکی هەوڵو تەقەلابووین چاوم بەگوندنیشنەکە کەوتەوە.

بەلام ئەمجارەیان ئەو بەچاوێکی پڕ ئومێدەوە سەیرێکی ڕووخساره بێ چارەکەی منی کردو وتی:

–ماندوو نەبیت مامۆستا! ئیتر من دەڕۆم، بەخوات دەسپێرم..

لەکۆتاییشدا پیاوە پیرەکە دەستەلەرزۆکەکانی خستە سەرشانمو وانەیەکی ژیانی پێ وتمەوە:

–تۆ کەسانێکت هەبوو! واستەت هەبوو، هەروەها هاوەلانێکت هەبوون کەوەك پەروانە بەدەورتەوە بوون، بەلام من هیچ!!

لەبەرئەوە پەروەردگارم بەمە قایل نەبوو.

تۆپشتت بەواستەی مرۆڤەکان بەست، بەلام سەرکەوتوو نەبوویت، هەرچی منیشم پشتم بە پەروەردگارمو بەزەیی ئەو بەست، سەرکەوتووش بووم.

من زۆر قسەی جوان نازانم... بەلام ئەوە دەزانم کە:

"هەرکەسێك پشت بەخودا ببەستێت سەرکەوتوو دەبێت، هەرکەسێکیش پشت بەبەندەی خودا ببەستێت لەدەستی دەچێت."

من بۆچارەسەر چووبوومە ئەو نەخۆشخانەیە، بەلام چارەی من ئەو دکتۆرانە نەیان کرد بەڵکو گوندنشینێکی سادەکردی.

"هەرکەس پشت بە بەندەکان ببەستێت لەدەستی دەچێت،
هەرکەسێك پشت بەخودا ببەستێت سەرکەوتوو دەبێت."

ئایا وەسیەتنامەیەك هەیە هێندەی ئەمە مەبەستەکەی پێکابێت!



## ژووانە پڕ نهێنییەکە

کاك خالید،

من بەڵێنم بەئێوە دابوو کە ئەو ڕووداوە پڕ نهێنییەتان بۆبگێڕمەوە کەبەسەرمدا هاتبوو، نازانم تا چەند دەتوانم بیخەمە سەر کاغەز! لەبەرئەوەی توانای نووسینم کەمەو پێم وانیە بتوانم بەتەواوی دەری ببڕم، بەهەرحاڵ..

باسی نزیکەی پێنج ساڵ لەمەوبەرتان بۆدەکەم، ئەوکاتە قوتابی بووم لەبەشی تەکنیکی زانکۆی (کارادەنیز) لەناو گرووپی هاوەڵەکانیشمدا بەپێشەوایان دادەنرام، لەچاوی خۆمدا تاکێکی ئایدۆلۆژی خواز بووم کەدەمتوانی لەچاوتروکانێکدا دونیا ڕزگاربکەم.

بەهۆی بیروڕا توندو دەمارگیرییەکانمەوە، نەمن حەزم بەکەس دەکرد نەکەسیش چارەی منی دەویست، بەو واتایەی لەجەنگێکدا بووم هەم لەدژی خۆمو هەم لەدژی کۆمەڵگەکەم.

دایكو باوکم کەسانێکی خاوەن دین بوون، بەڵام من بەتەواوەتی دژی ئەو شتانەبووم، لەبەرئەوەش بەردەوام لەگەڵ خێزانەکەمدا لەشەڕدابووم.

هاوڕێیەکم هەبوو کەلەهەمان پۆلی ئێمەبوو، کەسێکی ژیرو خانەدان بوو، پەیوەندییەکی گونجاویشی هەبوو لەپۆلدا، لەگەڵ هەمووانیشدا پەیوەندییەکی باشی دروست دەکرد.

جار جار لەپۆلدا موناقەشەدروست دەبوو، منیش هەندێك جار لەگەڵ قوتابیەکانداده‌کەوتمە موناقەشەیەکی قورسەوە، بەڵام ئەو هاوڕێیەمان لەکۆتاییدا قسەی دەکرد، بێ ئەوەی دڵی کەس برەنجێنێت، ڕێگەیەکی مامناوەندی دەگرتەبەر، هەم تووڕەییەکانی دەڕەواندەوەو هەم هەردوولاشی ڕازی دەکرد.

من حەیرانی هەڵسوکەوتەکانی ئەو هاوڕێیە بووم، چۆن دەکرێت کەسێك بەو جۆرە ئارامگرو سنگ فراوان بێت! ئایا ئەمانە وەك ئەوەی کە هەندێ کەس دەیڵێن تایبەتمەندییەکی خۆڕسك بوون! یاخود دوای هەوڵێکی زۆر توانیویەتی بەدەستیان بهێنێت!

بۆئـەوەی پرسـیار دەربـارەی هـەموو ئەمانـە بکـەمو مەراقـەکانم بڕەوێنمـەوە بڕیـارم دا قسـەی لەگـەڵ بکـەم، چـونکە ئـەو کەسـێکی تـابلێی، پاریزکـارو منـیش بەتـەواوی لەلاڕێـدابووم، بەڕواڵـەت هـیچ خاڵێکی هاوبـەشمان نـەبوو، بـەڵام هەڵسوکەوتەکانی ئـەو کاریگـەری لەسەرم هەبوو، لەناخەوە هەستم بەخۆشەویستی دەکرد لەبارەیـەوە، وتم:

–دەتوانم قسەتان لەگەڵ بکەم؟

ڕاستیەکەی زۆر سەری سوڕماو پرسی:

–سەبارەت بەکام بابەت؟

–سەبارەت بە بابەت نا، تەنها دەمەوێت لەنزیکەوە بتان ناسم.

–من کەسایەتیەکی تایبەتیم نییە کەشایەنی لەنزیکەوە ناسـین بێـت، من کەسێکی ئاساییم بەڵام مادام ناسـینی خـاتوونێکی زانسـتپەروەرو تێگەیشتوو وەك ئێوە بێت کێشەنییە.

ئەمەبوو ئەولایەنەی ئەو کەکاریگەری لەسەر من دروسـتکردبوو مـن کەسێکی ئاسایی بووم، بەوشـێوەیە بـەهرەی تایبـەتیو زانیـاری لـەو شێوەیەم نـەبوو، جـاریٚ بـەهیچ شـێوەیەك (خـاتوون) نـەبووم، بـەڵام بەشێوازی خۆ لێك نزیـك کردنـەوەیو بـەو گرنگییـەی کـە بـەمنی دا، پـێش ئـەوەی قسـە بکـەین، هـەنگاوێك پـێش مـن کـەوتو تـوانی سەرکەوتوو بێت.

لەگەڵ هاوڕێیەکمدا کەناوی (ئێدا)بوو، ئـەویش زۆر مـەراقی ژیـانی (سەلیم)ی دەکرد پێکـەوە ڕۆیشـتین بـۆ شـوێنێکو سـەلیمیش لەگـەڵ هاوڕێیەکیدا هاتبوو، نزیکەی کاتژمێرێك قسەمان کرد.

من بەردەوام پرسیارم سەبارەت بـە خـۆی لـێ دەکـرد، بـەڵام ئـەو زیـاتر حـەزی دەکـرد لەسـەر ئایـدۆلۆژیاو فیکـرو بـەهای فەرمانـەکان بدوێت.

لەکاتی قسەکانیشدا هێرشی نـەدەکردە سـەر هـیچ لایـەنێکو تـەنها باسی لەجوانییەکانی بیروڕاکەی خۆی دەکرد.

سەرنجی قسەکانیم دەدا هیچ تووڕەنەدەبووو سوکایەتی بـە کـەس نەدەکرد، بەردەوام لەکاتی قسەکردندا ڕەچاوی لایـەنی بەرامبەریشـی دەکـرد. تەنانـەت بـۆ تاقیکردنـەوەی بـیرو بۆچـوونەکانی لەکاتێکـدا هێرشـێکی تونـدم کـردە سـەر بیروباوەڕەکـانی، بـەڵام ئـەو وازی لەخۆڕاگری‌و خوێن شیرینی خۆی نەهێناو تەنها وتی:

-ئەم قسانە، ناکرێـت قسـەی خـاتوونێکی وەك ئێـوە بـن، چـونکە ئێوە فیکرتان بەجۆرێك دەدوێت‌و هەستەکانتان بەجۆرێکی دی، ئەمە لەسـەرنجەکانتانەوە تێدەگـەم، ئێـوە هاوسـەنگتر لـەوەن کەدەردەکـەون. ئەگـەر بەوشـێوەیەش نەبوومایـە کـە ئـەو دەیـوت ناچاربووم کەوام لێ بێت، ئەو پیاهەڵدانەی ئەو منـی شـەرمەزار کـرد، ئەو ناچاری کردم هەنگاوێك بێمە دواوە.

خوێن گەرمی و ڕەوشتی دڵسۆزانەو وتەکانی سەلیم زۆر کاریان تێ کردبووم، ئەو بەڕاستی کەسێکی بانگخوازبوو، ئەو وەك من بێ وردەکاریو بەهەڵەشەیی بانگەوازی نەدەکرد بەڵکو بەبێ دەنگیو لەقووڵاییەوە نزیك دەبوویەوە.

لەقسەو هەڵسوکەوتیدا بەتەواوی مانا وەستای "کاریگەری دروستکردن لەسەر مرۆڤەکان" بوو هۆکاری ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ زۆر خوێندنەوەی کتێب.

ئێستا سەلیم هاوسەری منە.

لەبەرئەوەی هاوسەرگیریم لەگەڵ باشترین پیاوی دونیاداکردووە لەهەموو نوێژێکمدا سوپاسی پەروەردگارم دەکەم.

باوەڕم وەهایە کەهەرکەسێك بیەوێت خۆی پێ بگەیەنێت دەتوانێت ببێت بەسەلیمێکی تر.

ئێستاش هەرگەنجێك ببینم بۆی باس دەکەم، هاوسەرانێك هەڵبژێرن کە خواناسبێت دڵی بەخۆشەویستی ئەوەوە بەندبێت، چونکە ئەوان کەسانێکن لەبەر خاتری خودا دەژینو بەسۆزو سنگ فراوانن، هەڵبەت ئەگەر دەتانەوێت ئەو خۆشبەختییە بچێژن کە من دەیچێژم...لەگەڵ ڕێزدا.

**(ناوەکەی پارێزراوە)**



# چۆن دەتوانم ڕزگارم بێت لە ئالودەبوون بە تەماشاکردنی وێنە بێئابڕووەکان

من گەنجێکی تەمەن هەژدەساڵ بووم کە لەبیرۆکەی تەماشاکردنی وێنەی بێ ئاڕوودا نوقم بووبووم، بیرو هۆشم پڕ بوو لەوێنەو دیمەنی ڕووت.

نەمدەتوانی لە سەیرکردنی وێنەی حەرام دووربکەومەوە، مێشکم وەك مەکینەیەکی وێنەگرتنی لێهاتبوو کەتەنها وێنەی حەرامی دەگرت.

وام لێ هاتبوو جگە لەو دیمەنانە نەمدەتوانی بیر لەهیچ شتێکی تر بکەمەوە، هەستەکانم ماندوو نەدەبوون لەڕاکردن بەدوای ئەو کارە سووكو سادانەوە !

لەبەر ئەوەش ئارامیو ڕاستگۆییو ژیانی قوتابخانەم ژێرەوژووربووبوو.

نەمدەتوانی هۆکاری ئەو سەرنەکەوتنانەم بۆخۆمو خێزانەکەشم ڕوون بکەمەوە.

کاتێک هاوڕێکانم دەیان بینی کەحاڵەتی دەروونیم بەلاڕێدا دەڕۆیشت هەندێك جار هاوکارییان دەکردم، بەڵام هەندێکی تریشیان بەپێچەوانەوە ڕووبەڕوویان دەبوونەوە.

کەمال، ئەو هاوڕێیەی کەوەك من ئەویش بووبووە ئەسیری ئەو دیمەنانە دەیوت:

-گوێ مەدەرێو بە کەیفی خۆت بکە، یەکجار دێیتە ئەم دونیایەوە، مرۆڤ لەگەنجێتیدا دەبێت لەگەڵ هەستەکانیدا بژی، بەو شێوەیە کەیف خۆشو دڵخۆش دەبێت، برۆ بگەڕێ، سەیربکە، خەون ببینە، دڵخۆشبە.

لەبەرئەوە دیوارەکانی ژوورەکەم بەوێنەی ناشیرین پڕکردبویەوەو بەدرێژایی ڕۆژ نەمدەتوانی چاوەکانم لەسەریان لاببەم.

نزیکترین هاوڕێم کە (سەعید) بوو، لەهەر دەرفەتێکدا بۆی هەڵبکەوتایە دژایەتی دەکردمو دەیوت:

-ئەگەر پەروەردگار شتێکی بەحەرام نووسیبێت، ئەوا حیکمەتێکی تێدایە، سەرقاڵ کردنی مێشکو چاوو خەیاڵ بەو دیمەنانەهەم

کەسەکە گوناهبار دەکات، هەم هاوسەنگی لەدەست دەدات. وەك کۆیلەیەکی داماوت لیٚ هاتووە لەبەرامبەر دیمەنی بیٚزراوی ئەو ویٚنەناشیرینانەدا وەك کۆیلەی هەستەخراپەکان...

ئەوە تۆنیت کەجلەوی خۆت گرتبیٚت، بەلکو جلەوی تۆ ئیٚستا لەدەستی نەفستو هەستە خراپەکانتدایە تۆ وەك جانەوەریٚکی داماوت لیٚ هاتووە کەلیك بەدەمیدا دیٚتە خواریٚو بەدوای پارچە گۆشتیٚکدا دەگەریٚت.

سەیری خۆت بکە، ئەوە دووساڵە لەتاقیکردنەوەکانیشدا دەرناچیت، ئەمەگەورەترین لەدەست چوونە بۆتۆ دایكو باوکت تووشی خەفەت کردووە، تووشی دوعای خراپی ئەوانیش دەبیت ئەمەش دووەمین لەدەستچوونی تۆیە.

لەناو کۆمەڵگەشدا وەك کەسیٚکی سەرکەوتوو ریٚزدار دەرناکەویت ئەمەشیان سیٚیەم لەدەستچوونتە.

وای لیٚ دیٚت هەرکەس بتبینیٚت لیٚت هەڵدیٚتو خۆیت لیٚ دەپاریٚزیٚت ئەمەش چوارەمین لەدەستچوونە.

بەلاّم لەهەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەیە کە لەناو کۆمەڵگەدا وەك کەسیٚکی باوەرپیٚنەکراو دەناسریٚیت ئەمەش پیٚنجەمین لەدەست چوونی تۆیە.

ئێستا دەتوانیت پێم بڵێیت؟ تۆ دەتەوێت ژیانت بەشێوەیەکی نەخوازراو و لەحاڵێکی سەرشۆڕیدا بەسەر ببەیت؟ یاخود ژیانێك بژیت کە ببیتە جێی سەرنجو تەقدیری خەڵکیو داوێن پاكو ڕێزلێگیراو بیت؟

سەعید ڕاستی دەوت، بۆیە هاوارم کرد بەسەریداو وتم:

—کەواتە، چۆن دەتوانم ڕزگارم بێت؟!

وتی:

—وەرە بۆلای ئێمە، ئێمە لەگەڵ گرووپێك لەهاوڕێیاندا دونیایەکمان بۆخۆمان پێك هێناوە، لەوێ حەرام بوونی نییە، تەنها حەڵاڵ هەیە خیانەت بوونی نییە، بەڵکو دۆستایەتی هەیە.

من باوەڕم وایە کە تۆش دووبارە دەتوانیت خۆت بدۆزیتەوە..

منو سەعید دەرچووی هەمان قوتابخانەبووین، ئەو بەشی پزیشکی وەریگرتو چووە ئەوێ، منیش لەناو ئەو بۆشاییەی ژیاندا کە خووم دابوویە ئەو وێنە بێ ئابڕوانە هەروا مابوومەوە.

پێکەوە چووین بۆئەو ماڵەی کەئەو تیایدا دەمایەوە، شوقەیەکی جوانیان بەکرێ گرتبوو، چوار خوێندکاری پزیشکی پێکەوە کۆبووبوونەوە دونیایەکی جوانیان خولقاندبوو.

کاتێك لەدەرگا چووینە ژوورەوە دوو وێنە سەرنجیان ڕاکێشام:

لەژێر یەکێکیاندا نووسرابوو:

"لەزینا نزیك مەبنەوە، چونكە ڕۆحی مرۆڤ دەكوژێت، دەیكاتە بەندەی هەستەكانیو وەك مردوویەكی زیندووی لێ دەكات."

بەڵێ ئەوە من بووم، ئەو ڕستەیە پێناسەی منی دەكرد.

سەعید كاتێك بینی زۆر تاساوم دەستی گرتمو وتی:

–هەموو ڕۆژێك ئەو تابلۆیە دەخوێنمەوە، وەك دەرمان وایە بۆئێمە ئەگەر نا گوناهەكانی كۆمەڵگە وەك ئەژدیها مرۆڤ قووت دەدەن.

نووسراوی ژێر تابلۆی دووەم سەیرتربوو:

"تەماشاكردنی ئافرەتی مردوو بەچاوێكی نەفسانییەوە، نیشانەی ڕسوایی ئەو كەسە دەردەخات، سەیركردنی وێنەی خراپ كەلەحوكمی مردوودایە جوانی ڕۆح دەكوژێنێتەوە".

تێگەیشتم، زۆر باشیش تێگەیشتم.

مرۆڤ ناتوانێت بەتەنها بەرەنگاری گوناهو هەڵەكان ببێتەوە:

"هەركەس گرووپێكی باش لەهاوڕێ هەڵبژێرێت، دەبێتە كەسێكی باش"

من لەو چەند ڕۆژەدا كەلەماڵی سەعید بووم زۆر باش لەو قسەیەی باوكم تێگەیشتم.

سوپاس بۆپەروەردگارم!

ئێستا وەسیەت دەكەم...

بۆئەوانەی كە هێشتا نەكەوتوونەتە داوەكانی ژیانەوە...

بۆنەوانەی لەناو تاواندا پەلە قاژەیانەو دەیانەوێت ڕزگاریان بێت!

بۆنەوانەی داوای هاوکاری دەکەنو دەڵێن:"حاڵی ئێمە چی لێ بەسەر دێت!"

وەسیەت دەکەم بە:

هاوڕێیەك کەخودا بناسێتو دەوروبەرێك کە ملیان بۆقورئان کەچ کردبێت.

جگەلەمە ڕێی ڕزگاریتان نییە...

وەسیەت دەکەم...

(ناوەکەی پارێزراوە)

# بوومه قوربانی

## هەڵەکانی خۆم

بەداخەوە، بۆ سەروبەری ژیان لەگەڵ گرووپێك لە هاوڕێی سەرسەریەو، ویستی ژیانێکی سەرکەشانی منیشی بەلای خۆیدا ڕاکێشا..

خۆدزینەوە لەوانەکانی ئامادەیی، قۆپی کردن، فشار خستنە سەر گەنجەکانی دەوروبەرم، پارەوەرگرتن لەهەندێك لەمنداڵە دەوڵەمەندەکان...

هەموو ئەمانە لەسەرەتادا وەك سەرکەشییەکی شیرین دەردەکەوتن.

هەمووشتەکان بەدەرکەوتنی مامۆستای ئەدەبیاتمان دەستی پێکرد، سەرەڕای ئەوەی چەندین مامۆستامان بەهەڕەشە بێ دەنگ کردبوو، بەڵام مامۆستا (یاقون) ئازایەتی خۆی سەلماندو تا دەرکردنمان لەقوتابخانە نەوەستایەوە...

بۆئەوەی والەمامۆستا بکەین واز بهێنێت، هەرچی لەدەستمان هات کردمان..

هەڕەشمان کرد، سەیارەکەیمان پەنچەرکرد، جامەکانیمان شکاند، لەکۆتاییشدا لەناوەڕاستی شەقامەکەدا زۆر بێ ڕەحمانە لێمان دا..

بەڵام ئەو وازی نەهێناو وتبووی:

-پێویستە کەسێك خۆی فیدابکات بۆئەوەی ئەم جانەوەرانە خاوێن بکاتەوە...

لەکۆتاییشدا ئێمەی بەدەرکردن دا..

لەسەر حەقیش بوو..

تومەس ئەو ڕێگەیەی کەئێمە چووبووینە سەری و ژیانێکی شێتانەمان دەویست پڕ بوو لەبەربەست و ناڕەحەتی و نەهامەتی.

بەڵام ئێمە ئەوەمان نەدەزانی..

نەسیمی لاوێتی دابووی لەسەرمان، گوێمان لە مامۆستاکانو دایكو باوکمان نەدەگرت.

دەرگای عەقڵمان بەڕووی هەر ڕاستیو ئامۆژگاریو حەقیقەتێکدا داخستبوو.

دانەدانە لەگەڵ قوتابخانە، خێزان، شار، هەروەها هەموو دۆستو خۆشەویستەکانم پەیوەندیم پچڕا.

کاتێك لەڕاستییەکان تێگەشتمو زانیم ئەو کارانەی کەدەیانکەم زۆر هەڵەن، کار لەکارترازابوو.

بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر، دزی کردن و پیاو بریندارکردنو دوو تاوانی پیاوکوژی..

لەو تەمەنە گەنجێتییەمدا کە ڕەشەبا سەر شێتەکان ژیانمیان سەرەوژێر کردبوو، من بەتەواوی تەنیابووم.

چیتر ئەو کەسانەی کە پێیان قبووڵ دەکراو ئەو دۆستانەشی کە پاڵیان پێوەنام بۆ ئەو ڕێیە، لەلام نەمابوونەوە...

چیتر زیندانماڵی من بوو، بەڵام لێرەش ڕاحەت نەبووم، چونکە یەکێك لەو دووپیاوەی کە کوشتبووم پیاوی گرووپی مافیاکەی بەرامبەرمان بوو، دەمزانی کە باجی ئەوەم بەژیانم لێ دەسێننەوە.

منیان خزاندە تەوالێتی زیندانەوە.. ژمارەی ئەو شیشانەی کە دەکران بەجەستەمداو دەردەهاتنەوە لەژمارە نەدەهاتو بێ سنووربوو، پێم وابێت وایان زانی مردووم بۆیە لەوێ بەجێیان هێشتم.

کاتێک چاوم کردەوە لەنەخۆشخانەو لەناو خوێنو سیرەمدا گیرۆدەی ئازارێکی سەخت بووبووم.

تەواو هۆشم بەخۆم نەبوو، ژاوەژاو دەهاتە بەرگوێم، چاوەکانم وەک پەنجەرەیەکیان لێ هاتبوو کەبەپەردەی دڕاو داپۆشرابێت، دیمەنەکان پچڕ پچڕو لێڵ بوون.

ئەنجامەکە زۆر ترسناک بوو! شیشەکان جەستەمیان پارچە پارچە کردبوو، لەبەرئەوەش ڕیخۆڵەباریکەمیان بڕیبوو ئیدرارمیان بۆدەرەوە بەستبوو.

پێویست بەوە ناکات بزانرێت کە ئەمە واتای چی بوو! تەنانەت بیرکردنەوەش لێی ئینسانی دەتۆقاند..

فاتورەی گوێ نەگرتن لەگەورەکان، گوێ نەدانە ژیان، بینینی ژیان وەک سەرکەشییەک، لێدانی مامۆستایەک لەناوەڕاستی شەقامدا تەنها لەبەرئەوەی دەیویست زانستو ڕەوشتمان فێر بکات هەر ئەمەبوو.

پەروەردگارم بەجۆرێك باجی لێ سەندمەوە. ئازاری ئەوەی کە مامۆستاکەمان ناردە نەخۆشخانە، بەوشێوەیەش خۆم کەوتمە نەخۆشخانە، ئەویش وەك مەحکومێکی حوکمدراو بەحوکمێکی قورس

لەزینداندا.. تەنها ئەمە؟! خۆزگە تەنها خۆم باجی هەڵەکانم بدایەتەوە.. دایکی بێ پارەم دەیتوانی بەرگەی کوڕە سەرپێچیکارەکەی بگرێت کە بەبەرچاویەوە لەدەست چوو..

باوکی داماویشم، بەسێ چوار قرانمووچەی فەرمانبەرییەوە، باری خێزانەکەی لەئەستۆگرتووە، ئەویش نەخۆشی فشاری خوێنی هەیە، ئەگەر ڕۆژێك هەواڵی بەئێشی ئەویشم پێ بگات ئەوکات چی بکەم!!

بۆچی باسی ئەمانەم بۆ کردن؟!

بۆئەو گەنجانەی لەتەمەنی مندان، بۆئەوانەی خویان داوەتە هەمان خەیاڵەکانی منو دەیانەوێت تامی ژیان بکەن! بۆئەوانەی خۆیان داوەتە دەست سیحرەکانی دونیایەکی بێ ئامانجو دەڵێن: "گوێ مەدەرێ، بەمن چی!"

بۆهەموو ئەوانەی کەگەنجێتیان بە نەفسە سەرپێچیکارەکەیانەوە بۆدۆزەخ گۆڕیوە..

ئەگەر دەتانەوێت بزانن کۆتاییتان بەکوێ دەگات، سەیری من بکەن.. چونکە ئەم ڕێیە دەگاتە هەمان شوێن..

یان بەندیخانە..!

یان نەخۆشخانە..!

یاخود گۆڕستان..!

ئەگەر ماڵێکتان هەیە کەئێوارە دەتوانن بۆی بگەڕێنەوە..

ئەگەر دایكو باوكتان دەتانخەنە سەر سنگیانو پێتان دەڵێن: "ڕۆڵەكەم!" ئەگەر توانای سك پڕكردنو تێر نوستنتان هەیە!

كەواتە: ئێوە بەختەوەرترینو دەوڵەمەندترین كەسی دونیان. چاكەیەك لەگەڵ خۆتان بكەنو بەسەركەشیو خەیاڵەوە بەدوای داهاتوودا مەگەڕێن، باعەقڵو مەنتیقتان ڕابەرتانو ئامۆژگاریو تەجروبەی گەورەكان ڕووناكی ڕێتان بێت.

من قوربانی دەستی هەڵەكانی خۆمم، لەحاڵی من بڕوانن و پەند وەربگرن بزانن كە هاوڕێی خراپ، ڕێی خراپ، كاری خراپو قازانجی حەرام باجی زۆر قورستان پێ دەداتەوە...

باقسەی گەنجێك كە زەمانێك بوو ژیانێكی خێراو خەیاڵ پەرستو لەخۆباییو سەركەش دەژیا، ئێستاش باجەكەی زۆر بەسەختی دەداتەوە هاوكارتان بێت بۆدۆزینەوەی ڕێی ڕاست.

باوەڕتان بەوە هەبێت كە داوای چی لەپەروەردگاری مەزن بكەن، هەرچی یەك بێت، پێتان دەبەخشێت..

ئەگەر ئەم فیلمی ژیانە بخرێتەوە سەرەتاو دووبارە مافی هەڵبژاردنم پێ بدرێتەوە، ئەم دوو شتە هەڵدەبژێرم:

١- ڕەزامەندیو دوعای دایكو باوك.

٢- بەندەیەكی شایەن بەپەروەردگار.

ئەمە وەسیەتی منە، بەڵام هەڵبژاردنی لەدەست ئێوەدایە...

(ناوەکەی پارێزراوە)



## لەوە دەترسم

## باوکم بەبێ ئیمانی بڕوات

مامۆستای بەڕێزو موحتەرەم..

سەرەتا سڵاوی خواتان لەسەربێت.

بەوپەڕی ڕێزەوە دەستەکانتان ماچ دەکەم..

مامۆستا بەتێپەڕبوونی کات خەریکە دەرهاتنەوەم ئەستەم دەبێت و تاقیکردنەوە قورسەکانم بەردەوامن..

پێشتر چیرۆکی ژیانم بۆئێوه باس کردبوو، دوو ڕۆژ لەمەوپێشیش کتێبەکانی "من لەئاگردا سەوز بووم" و "کۆتا هەناسە لەسوجدەدا"م خوێندەوە.

بەفرمێسكو هەنسك دانەوە کتێبی ژیانی جەنابتانم خوێندەوە.

چەندە لەژیانی من دەچوو! لەگەڵ خوێندنەوەی هەر لاپەڕەیەکیدا خۆڕاگریم لەدەست دەداو نەمدەتوانی پێش بەفرمێسکەکانم بگرم فرمێسکەکانم وەك لافاویان لێ هاتبوو.

باسی باوکمم کردووە بۆتان، ئەو ئێستا نوقم بووە لەقومارکردندا، چی بڵێمو چی بکەم، نەمتوانی وای لێ بکەم گوێم بۆ بگرێت، گوێ لەمن ناگرێت، نیوەشەو دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە، ئەندامەکانی خێزانەکەم بەشێوەیەك دوژمنن بەیەك، کەئەگەر لەدەستیان بێت یەکتری دەکوژن..

بەردەوام لە شەڕو دەمەقاڵێداین...

هەرچی دایکیشمە باری دەروونی تەواو نییە، من لەجەوێکی ئاوەهادا چوومەتە قەپاغی خۆمەوە، باوەشم کردووە بەکتێبەکانی ئێوەدا و پشتم بەبەرهەمەکانی سەعیدی نوورسی بەستووە، پێشنیارەکانی ناو کتێبەکانتانم خوێندەوە، بەردەوام بە دوعاو پاڕانەوەو خوێندنەوەی جەوشەن دەژیم.

مامۆستا، من کەسێکی بێدەنگم، هەموو شتەکان لەناخمی خۆمدا دەهێڵمەوەو، هیچ کەسێکم نییە کەقسەی لەگەڵدابکەم. بەتەواوی گۆشەگیر بووم، چونکە دەوروبەرەکەم هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ دین نییە، بۆ ئەوان تەنها ژیانی دونیا بوونی هەیە، هیچ کەسێکی لێ نییە کەباوەڕداربێتو نوێژبکات.

پەیوەندیمان لەگەڵ خزمو کەسو کارماندا ئەوەندە کەمە کە دەتوانین بەنەبوو حسابی بۆ بکەین. دڵەڕاوکێو ململانێیەکی زۆر لە خێزانەکەمدا هەیە.. دەمەقاڵێ.. توندوتیژی.. شەڕی بەردەوام.. مامۆستا من زۆر ناموڕتاحم.

هاوسەرەکەم هیچ هەواڵم ناپرسێت، هەمیشە لەخوا دەپاڕێمەوە. بەنیازم داوای تەڵاق بکەم، من ئیتر بێزاربووم، مامۆستا، بۆمانەوەم بەپێوە پێویستم بەموعجیزەیە، ئێستاکەش بەزۆر ئەم ڕستانە دەهۆنمەوە.

بۆ هەموو شتێك فرمێسك دەڕێژم، تەندروستیم تێکچووە گورچیلەکانم تووشی خوێن بەربوون هاتوون.

بەرهەمەکانی جەنابتانو سەعیدی نوورسی تەنها هۆکاری مانەوەی منن بەپێوە..

نوێژەکانم ئەنجام دەدەمو جەوشەن دەخوێنمەوەو بەردەوام لە خوا دەپاڕێمەوە:"خوایەگیان بمخەیتە ڕیزی قوتابیانی پەیامەکانی

نوور و، هیدایەتم بدەیت تابتوانم لەکۆڕە دینیەکاندا لەگەڵیاندا بم‌و لەگەڵ ئەواندا شوکرانەبژێری نیعمەتەکانت بکەم‌و لێت بپاڕێمەوە، باپەیامەکانی نوور ببنە وەسیلەیەك بۆ گەیشتنم بە بەهەشت‌و لەگەڵ ئەو جەماعەتەدا چاوەکانم لێك بنێم.."

مامۆستا تکادەکەم هاوکاریم بکەن، توانای تەحەمول کردنم نەماوە گەورەترین خەیاڵم تەواوکردنی خوێندن‌و پێك هێنانی ژیانێکی بەختەوەر بوو.

دەموت:"من هیچ کات ناهێڵم ئەو شتانەی بەسەرمداهات، بەسەر منداڵەکانمدا بێتەوە."

بەڵام ئەوە ڕووی نەدا، بەداخەوە هەموو شتەکان نەگەتیڤن.

مامۆستا،ئومێدێکم هەیە.

بەڵام ئەو ئومێدەم هاوسەرگیری نییە، بەڵکو بوونە بەقوتابی نوور، هەوڵدانە، هاوکاریکردنە، دەمەوێت لەگەڵ کەسە ڕووخسار نوورانیەکاندا هەوا هەڵبمژم.

مامۆستا، تکایە هاوکاری ئەم کچەتان بکەن... لەژیانێکی ناهەمواردام نامەوێت خۆم بکوژم، بەڵام توانای بەرگەگرتنیشم نەماوە.

هەرچەندە لەلایەکیشەوە سوپاسی خوا دەکەم، ئەو قسەیەی سەعیدی نوورسیم دێتەوە یاد کەدەڵێت:

"ئەی بێچارە! واز لە سکاڵاکردن بهێنە لەدەستی بەڵاو موسیبەت، وەرەو تەوەکول بکە، چونکە سکاڵاکردن لەبەڵاو لەهەڵەش خۆی لەخۆیدا بەڵایەکی ترە، ئەگەر ئەو بەڵابەخشەت دۆزییەوە، ئەوە بزانە کە ئەو بەڵایە لەناو ئیحسان و بەخششی ئەودایە، واز لەسکاڵا بهێنە، سوپاسگوزاربە وەك چۆن بولبولەکان سوپاسگوزارن لەکاتێکدا کە گوڵەکان بەشەوقەوە پێدەکەنن."

چەندە جوانی وتووە مامۆستا!

شتێکی تریش هەیە مامۆستا، من لەوە دەترسم کە باوکم بەوشێوەیە بمرێت، لەیەکێك لەبەرهەمەکانی ئێوەدا چیرۆکی ژیانی باوکێکم خوێندەوە کە بە بێبارەری وەفاتی کردبوو.

خوێنی جەستەم خەریك بوو دەمەیی، من ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم کەباوکی منیش بەو شێوەیە بڕوات!

مردنێکی لەو شێوەیە!؟ دەترسم باوکی منیش باجێکی وەها قورس بدات، هەوڵەکانم بۆ گەڕاندنەوەی ئەو بۆسەر دین بێ ئەنجام بوون.

ڕۆژی هەینی خەوم لێ کەوتبوو، لەخەونمدا دەنگێك پێی وتم:

"هەستە باوکت هەستێنەو زۆری لێ بکە تا بڕوات بۆنوێژ."

بەلـەرزەوە خەبـەرم بوویـەوەو کاتێـك هەسـتام صـەلای هـەینی دەخوێندرایەوە، ڕام کرد بۆلای باوکمو زۆر داوام لیَ کـرد تاقەناعـەتی کرد دووسیَ هەفتە ڕۆیشت بەڵام دواتر وازی لەنوێژی هەینیش هێنا.

مامۆستا دەترسم، پێویسـتم بـەنزای ئێـوە هەیـە، تکایـە هاوکـاریم بکـەن، هاوکـاریم بکـەن تـا پەیوەسـتبم بـە خۆشەویسـتی خـواوەو سوودلە کۆڕی ئایینی مرۆڤە ڕووخسار نوورانیەکانوەربگرم، لەبەرئەمە زۆر منەتباری ئێوە دەبم.

دوعای پڕنیەتە باشـەکانم لەگـەڵ ئێوەیـە، هاوکـاری ئـەم کچـەتان بکەن، پەروەردگارم بتانکاتە وەسیلەی ڕزگارکردنی چـەندەها کـەس، هـەروەها خۆتـانو خێزانتـان لەبـەڵاو خراپـە بپارێزێـتو بتانکاتـە وەسیلەی خزمەتکردن بەم دینە.

دووبارە خوالێتان ڕازی بێت کە گوێتان بۆگرتم، سەلامو ڕەحمـەتو بەرەکەتی بەردەوامی پەروەردگارم لەسەرتان بێت.

لەئەمانەتی خوادابن.

(ناوەکەی پارێزراوە)



# لەگەڵ دایكو باوكم
# ڕێك ناكەوم

مامۆستای بەڕێزم، خالید ئێرتوغروڵ.

من قوتابی قۆناغی دووەمی ئامادەییم، هاوڕێیەكم نامە بۆئێوە دەنێرێت كێشەكانی بۆئێوە باس دەكات، ئێوەش وەڵامی دەدەنەوە هەندێك لەنامەكانتان پێكەوە دەخوێنینەوە، منیش ئەم پەیوەندییە كاری تێ كردم.

بڕیارم دا كێشەكانم بۆئێوە باس بكەم.

كێشەی سەرەكی من دایكو باوكمە، ئەوانم زۆر خۆش دەوێت، تەنانەت ناتوانم بیر لەژیانێك بكەمەوە كە ئەوانی تێدا نەبن، بەڵام

ئەوان هیچ لەمن تێناگەن، لەهەر فرسەتێکدا دڵم دەشکێنن‌و دەمخەنە گریان.

سەرەڕای ئەوەش برایەکم هەیە کە تازە دەچێتە ناوەندی، باوکم زۆر بەقسە ئازاری دەدات‌و هەندێك جاریش لێی دەدات، ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم.

بەڵێ، ئێمە منداڵین، گەنجین هەڵەمان هەیە، ناتوانین وەك ئەوان بەتێگەیشتوویی لەژیان بڕوانین، بەڵام کاتێك هەر کردەوەیەکمان بە هەڵە لێك دەدرێتەوە، زیاتر هەڵە دەکەین.

لەکاتێکدا لەقوتابخانە دەگەڕاینەوە، هاوڕێییەکی کوڕ لەڕێگە سەبارەت بەوانەکانپرسیارێکی لێ کردم، دایکم ئەمەی بینی بوو، قیامەت هەڵگیرسا، من بوومە خراپترین کچی سەرزەوی، هەرچیم کرد باوەڕی پێ نەکردم.

من چیتر لەبەرامبەر ئەو هەڵسوکەوتە ڕەقانەدا کەسایەتیم خەریکە لەدەست دەدەم، نازانم دەبێ چی بکەم، تەنانەت ناشتوانم ئەوە جیابکەمەوە کە چ هەڵسوکەوتێك بەدڵی ئەوانەو لەکام هەڵسوکەوت ناڕازین.

کاتێك هاوڕێکانم باسی ئەوە دەکەن کە دایك‌و باوکیان چەندە تێگەیشتوون‌و جوان هەڵسوکەوت دەکەن، ئێرەییان پێ دەبەم.

منیش حەزم دەکرد دایكو باوکم، تێگەیشتوو و، ڕۆشنبیر بوونایە، واتە ئەگەر کێشەیەکم هەبوایە بمتوانیبایە لەباوەشی دایکم یان باوکم دابنیشتمایەو هەموو شتێکم بۆیان باس بکردایە، بمتوانیایە سەبارەت بە بابەتی جیاواز موناقەشەلەگەڵ باوکم بکردایەو بمتوانیایە بڵێم کە ئەو هەموو کات لەسەر حەق نییەو، بمتوانیایە لەگەڵ باوکمدا بڕۆیشتمایە بۆشت کڕین.

زۆر حەزم دەکردکە ئەو کاتانەی کەئەو تیایدا جەوێکی باشی هەیە، هەمیشە بەردەوام بێت، ئای مامۆستا! ئەگەر ئەمە ببێتە ڕاستی باوەڕ بکە دەبمە بەختەوەرترین کەسی دونیا.

خۆزگە..

چیتر بەو شێوەیە گوماناوییەش لێیان نەڕوانیمایەو متمانەیان پێ بکردمایەو، ئیعتباریان بۆ دابنامایەو بەچاوی بەنی ئادەم لێیان بڕوانیمایە..

پێویستە دایك نزیکترین دۆست بێت بۆ کچەکەی، باشترین نهێنی پارێزو هاوڕێیەکی نزیك بێت لەگیانیەوە، پێویست بوو کاتێك من بگەڕامایەتەوە بۆ ماڵ هەموو ڕۆژەکەمم بۆ باس بکردایە، ناڕەحەتیو خۆشییەکانم لەگەڵ ئەودا بەش بکردایە، پێویست بوو ئەو من بەجددی وەربگرێتو گوێم بۆڕابگرێت، کاتێك کە بینی هەڵە دەکەم

پێی بوتمایە: "تۆئەو کارەت کردووە، بەڵام ئەگەر من بوومایە نەمدەکرد" و بەشێوەیەکی شیرین ئاگاداری بکردمایەتەوە.

کاتێکیش کارێکی باشم بکردایە، دڵی بدامایەتەوەو بیوتایە: "منیش لەجێی تۆ بوومایە هەمان کارم دەکرد."

پێویستە بۆهاوبەشی کردن لەکاری چێشتخانەو خاوێن کردنەوەی ناو ماڵدا شتانێك هەبن لەنێوانماندا بۆباسکردن کە بەهۆیەوە حەز بەئیشکردن بکەم، پێویستە وەك مرۆڤ حسابم بۆ بکاتو گرنگیم پێ بدات.

دەستەواژەکانی وەك "تۆ تێ ناگەیت، تۆ ناتوانیت ئەنجامی بدەیت، دەیشکێنیت، تۆ گەوجیت، دەستت شکاوە!، کوێراییتە؟"

زۆر ئازارم دەدەن، دەمشکێنن.. وام لێ دەکەن ئەوەشی کە لەتوانامدا هەیە بیکەم نەتوانم بیکەم، دەستو قاچم تێکەڵ دەبن.

کاتێك دەبینم لەماڵەوە کەس لێم تێ ناگات، خانووەکەش بۆم تەنگ دەبێت، دڵم لەماڵەوە سارد دەبێتەوە، حەزم بۆچوونە دەرەوە زیاد دەکات و لەهەر فرسەتێکدا هەڵپە بۆ دەرەوەدەکەم، دەزانم ئەمە باش نییە بەڵام چارەی ترم نییە.

گوایە دایکم ئەو فشارەی کەدەیخاتە سەرم بۆ باش ڕاگرتن‌و چاکەی منە بەڵام ئەمەیە زیاتر من سارد دەکاتەوە لەماڵەوە. ئەمە

لەکاتێکدا پێویستە ئەوان بۆ ئەوەی من هەڵە نەکەم ببنە هاوڕێو دۆست بۆمو نەهێڵن پەنا بۆهاوڕێی تریبەم... وانیە؟!

هەڵسوکەوتەکانی باوکیشم زۆر ڕەقن، بەبڕوای باوکم تاکە عاقڵو تاکە کەسێك کە بیروباوەڕەکانی ڕاست بن خۆیەتی، هیچ کات گوێ لەمن ناگرێت گوێش بگرێت حەقم پێ نادات... بەردەوام ئازاری برابچوکەکەم دەداتو، لێی دەدات، کاتێك ئەو لێیان دەخوات من لێرەوە خەفەت دەخۆم.

هەندێك جار هاوڕێکانم دێن بۆماڵمان، بەجۆرێك لێیان دەڕوانن وەك ئەوەی خەریك بێت بیانخۆن، ئایا ئەمە هەڵە نییە؟! ئەمە لەجیاتی ئەوەی هانم بدەن بۆهێنانە ماڵەوەی هاوڕێکانم تا من نەڕۆمە دەرەوەو لەپێش چاویاندا بم، بەم شێوەیە هاوڕێکانیشم دەناسن.

کاتێك ناوبەناو دەچم بۆماڵی هاوڕێکانم ئیرەییان پێ دەبەم. دایكو باوکیان لەدەرگاوە بەخێرهاتنمان دەکەن، قسەی خۆشمان لەگەڵ دەکەن، میوانداریمان دەکەن و، بەردەوام داوا دەکەن کەبڕۆم بۆماڵیان، دواتریش زۆر ڕێك پۆشنو دەست بەخۆیاندا دەهێنن.

دایكو باوکی من کەسانێکی زۆر ناڕێکن لەجلو بەرگدا، زۆر گوێ بەجلو بەرگ نادەن، ئەم وەزعە ئەوانی زیاتر خوێن ساردکردووە. ئەگەر دایكو باوکم دەستیان بەخۆیاندا بهێنایە، قژیان بریقەی

بهاتایه، باوکم هەموو ڕۆژێك ڕیشی چاك بکردایە وەك بیست ساڵ لەمەوپێش خۆیان نەگۆڕییایە چەندە باش دەبوو.

باوکم کە خواردن هاتە بەردەستی یەکسەر دەیخوات، لەکاتی نان خواردندا ملّچەملّچ بەدەمی دەکات تەنانەت درك بەوە ناکات کە ئەو پاروانە لەدەمیدا چەندە دیمەنێکی ناشیرینیان هەیە.

جارێك وتم با باسی ئەو مەوزعەبکەم، یەکە دونیا ئازاریان دام.

لەبەرئەوەی باوکم عارەق‌و جگەرە دەخوات، دایکیشم مودمینی جگەرەیە، باری تەندروستیان زۆر ئازارم دەدات.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەوان دایك‌و باوکی منن و، ژیان بەبێ ئەوان سەخت و دژوارە؟!

بەتایبەت لەدوای خوێندنەوەی هەردوو کتێبی "من لەئاگردا سەوز بووم" و "کۆتا هەناسە لەسوجدەدا".

لەسایەی کتێبەکانتانەوە دەستم بەنوێژکردن کردووەو نوێژەکانم بە دزییەوە ئەدا دەکەم، چونکە لەهەڵپەساردنەکانی باوکم دەترسم کە دەڵێ: "تۆ دەتەوێت ببیتە کۆنەپەرست؟!"

ئەوان نازانن کەمن تاخودا زیاتر بناسم ئەوانم زیاتر خۆش دەوێت.

لەدوای هەموو نوێژەکانم نزایان بۆ دەکەم.

من لەناو خێزانێکی وەهادا دەژیم، پێویستە چی بکەم تا ئەم خێزانە والێ بکەم زیاتر شێوەی ژیان وەربگرێت!

دەزانم نامەیەکی زۆر درێژ بوو.

بەنووسینی ئەم نامەیە ئاسوودەبووم، بەجۆرێك وەڵامیشم دەست کەوت، چونکە کتێبەکانتانپێشنیارو ئامۆژگاریبەنرخیان تێدایە...

پەروەردگارم چالاکیو ئیمانو هێزتان پیێ ببەخشێت.

دەستەکانتان ماچ دەکەم.

(ناوەکەی پارێزراوە)



# زامی دڵێك

ئێمە لەلادێ لەدایك بووینو هەرلەوێش گەورەبووین، ئەو یاسایانەی کە نەریتو باوەکان دایان نابوو، ژیانی ئێمەشی ئاڕاستەدەکرد.

مـن تەمـەنم ١٧ سـاڵانو خێزانەکەشـم ١٥ سـاڵان بـوو کاتێـك هاوسـەرگیرییان پـێ کـردین، هاوسـەرەکەم لەهـەمان کاتـدا کچـە پووریشم بوو.

سـەرەڕای هـەموو ناڕەحەتییـەکانیش، ئێمـە یـەکمان زۆر خۆشدەویست، هیچ بێزاریش نەبووین لەوەی کەلەگەڵ دایكو باوکمـدا لەهەمان ماڵو لەژوورێکی بچووکدا بـووین، وەك دوو عاشـقی سـووتاو

چاومان لەسەر یەك لانەدەبرد، تەنانەت بۆ ساتێکیش دوور لەیەك هەڵمان نەدەکرد.

بەڵام لەژێر کاری سەختدا منیش‌و ئەویش هەموو ڕۆژێکمان بە نارەحەتی دەبردەسەر، ئەو یاسایانەش لەولاوە بوەستێت کە کۆمەڵگە بۆخێزانەکانی دانابوو.

نەماندەتوانی لەتەنیشت یەکەوە بڕۆین یان دەستی یەك بگرین، نەماندەتوانی لەتەنیشت گەورەکانی خێزانەوە دابنیشین، تەنانەت نەماندەتوانی منداڵەکانمان بگرینە باوەش‌و تێرماچیشیان بکەین.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئێمە هەر دڵخۆش بووین، لەگەڵ ئەوەشی کە بەڕۆژ لەیەك دووربووین، بەڵام نیگاکانمان بۆیەك ژیانمانی پڕکردبوو لەبەختەوەری.

هاوسەرە جوان‌و دڵ ئاڵتونیەکەم بێ ئەوەی بزانێت ئاکامی بەکوێ دەگات، ڕۆژێك قسەیەکی لەدەم دەرچوو..

دایك‌و باوك‌و گەورەکانی خێزانەکەم ئەم قسەیان بەڕاست‌و چەپدا گێڕا... شتەکەیان گەورەکرد، وەك کێشەیەکی ناموسیان لێکرد.

منیش لەژێر فشاری بێ مانای عورف‌و عادەت‌و خێزانەکەمدا، نەمتوانی دەم بکەمەوەو پشتی هاوسەرەکەم بگرم. بەیانیەك ئەویان دەرکردە دەرەوە، ناتوانم لەبیرم بچێتەوە کە چۆن ئاوڕی دایەوە

بۆمو پاڕایەوە: "تکایە مەهێڵە بڕۆم، من بێ تاوانم، دەبمە کۆیلە بۆت تەنها بهێڵە بمێنمەوە."

لەوکاتەدا هەزارەها چەقۆ جەرگیان بڕیم..

فرمێسکەکانم ڕشتە دەروونمەوەو گڕی دڵم لەناخدا ناشتو ئەو خەڵوزەی کەکەوتبووە ناخمەوە زۆر بێ ئامان دەیسووتاندم.

ئەمە بووە دابڕانێکی لەو جۆرە کە ئەو دووکەسەی تامردن یەکیان خۆشدەویست وەك بڵێی هەر لەوێدا کوشتبویانن، ئێمە چیتر نەدەژیاین، ئەوەی کەدەژیا جەستەی بێ ڕۆحو بێ هەستمان بوو.

لەهەموو خێزانو کۆمەڵگەو گوندەکەمان تۆرام، بڕیارم دا بڕۆمە دەرەوەو دوور بکەومەوە لەوگوندەی کە وەك دۆزەخ دەیسووتاندم، بەڵام ئاگری دەروونم هیچ کات نەکوژایەوە بەڵکو زیاتر کڵپەی دەسەند.

لەو هەواڵانەی کەسەبارەت بەو پێم گەیشت، دەمزانی کە هاوسەرەکەم ژیانی بەتەواوی بووەتە دۆزەخ، چاوەڕێی دەکرد بڕۆم بۆلای‌و هەرچی زووترە پێکەوە هەڵبێین.

بەڵام من لەکوێ خاوەنی ئەو ئازایەتیە بووم؟ لەکوێ بوو ئەو ئینسافو لێبوردەییەی ناو دابو نەریتی گوندەکەمان!

ئەو خەیاڵانەی کە دەمکردن بەکەڵکی هیچ نەهاتن، دواتر بیستم کەژنەکەمیان داوەتە پیاوێکی پیر، ئەویش بەزۆر..

بەڵام خۆڕاگری ئەو تاچەند کەڵکی هەبوو؟ بەردەوام ئەشکەنجە و تێهەڵدان و ئیهانەکردن..

منیش هاوسەرگیرییەکی ترم کرد، بەڵام هاوسەرگیرییەکی ڕواڵەتی.

چونکە لەدوای ئەو من نەمدەتوانی ببمە مێرد بۆهیچ کەسێکی تر، کەسیش نەیدەتوانی بۆمن ببێتە هاوسەر.

منیش و ئەویش منداڵمان بوو، منداڵەکانی ئەویش گەورەبوون و منداڵەکانی منیش.. ئەویش بەتەمەنداچوو و منیش، منداڵەکانی ئەویش شوویان کردو ژنیان هێنا، منداڵەکانی منیش.

لەکۆتاییدا ژنەکەی منیش وەفاتی کرد، پیاوەکەی ئەویش، ئەو ئاگرەی کەساڵانێك بوو نەمتوانی بوو لەدەروونمدا بیکوژێنمەوە دووبارە بڵێسەی بەرزبوویەوە بۆئاسمان.

لەسەر تەشویقی هەندێك لەهاوڕێکانم و تەنانەت زۆرلێکردنیشیان لەکاتێکدا کەهاوسەرە کۆنەکەم بەتەنیا لەماڵەوە بوو تەلەفونم بۆکرد.

لە تەلەفۆنەکەوە دەنگێك دەهات کەهەموو خانەکانی لەشمیان زیندوو کردەوەو لەهۆش خۆم چووم.

وتی:

—ئەوەتۆیت؟ ببمە قوربانی ئەو دەنگەت، ئەوە خۆتی؟!

وەرەو تەحەمولی ئەمە بکە... ئەمە کۆتا دیمەنی ئەو فیلمەبوو کەساڵانێك لەمەوبەر پچڕابوو.

ئەو خۆشەویستییە سیحراویەو ئەو عیشقەی کەنەمانتوانی پێی بگەین، هەروەها ئەو هەستانە کەناتوانرێت پیاهەڵدانیان بۆ بکرێت... دووبارە لەدەمارەکانمدا ژیانەوە..

پێکەوە قسەمان کرد..

بێگومان ئەگەر ئەوە بەقسەکردن ناوبرێت، فرمێسکەکانمان بووبووە لافاو پەلەقاژەی دڵمان قەفەسی سنگمانی ئازار دەدا..

وتم:

-کەواتە تۆ چی دەڵێیت؟! واباش نییە ئەو نیکاحەی کەلەنیوەدا جێمان هێشت تەواوی بکەین؟!

وتی:

-من ئامادەم بۆت بمرم، پەلە بکەو وەرە، ئەگەر بتوانم بەم شەوقەوە ڕۆژم لێ بێتەوە، ئێستاکە دوای چل ساڵ لەبەردەم خانووەگڵەکەمدا چاوەڕێت دەبم، چاوەڕێم تا ئەو ڕووخسارە پرشنگدارەتو ئەو زەردەخەنە شیرینەت کەچل ساڵە بەخەیاڵیەوەم تێر لێیان بڕوانم.

نازانم چۆن بتوانم بەرگە بگرم کاتێك دەستم دەگرێت.

إن شاء الله ئەم حەسرەتە دەهێڵێت بگەمە سبەینێ.

خێرا وەرە من چاوەڕێتم. ئەوشەوە درێژترین شەوی ژیانی من بوو، بەیانی زوو بەیەکەم پاس کەوتمەڕێ، وام دانابوو پێش نیوەڕۆ

بکەمەئەویێ، هەموو ئەو ئەمانەتانەشم لەگەڵ خۆم برد کە پێم وابوو زۆر دڵی پێیان خۆش دەبێت و چل ساڵ لەمەوبەر یادگاری هاوبەشی ئێمەبوون.

کاتێك گەیشتمە بەردەم ئەو ماڵەی کە ناونیشانی دابوومێ هەموو گیانم لەرز دایگرت، بێگومان ئەو عارەقەی کەکردبوومەوە تەنها لەبەرئەوەنەبوو کەبەڕاکردن هاتبووم، بەڵکو لەبەر ئەو هەستە بوو کە دڵی گوشیبووم و ڕۆحمی تا ناو قوڕگم هێنابوو.

کاتێك لەبەردەمی دەرگاکەدا کەسم نەدی دەستم کرد بەڕوانینبەلای ڕاست و چەپدا.

کچێکی گەنج لەوێدا هەستی بەمەکردبوو بۆیە وتی:

-مامە، ئێوە بۆلای پووریێ هاتوون وانیە؟!

-بەڵێ، کچی خۆم.

-هێشتا کات ماوە، کەمێك لەمەوبەر بردیان بۆمزگەوت، لەدوای نوێژی نیوەڕۆ نوێژی جەنازەکەی دەکەن.

ڕووخام!

بەهەرنرخێك بێت، ئەمە سزای کەسێك بوو کەنەیتوانی پارێزگاری لەدڵێك بکات کە لەبەرخوا خۆشی دەویست...

**(ناوەکەی پارێزراوە)**



# خۆشەویستی دڵم

مامۆستای بەڕێزم، لەبەرئەوەی ناونیشانەکەتاننازانم لەبەرئەوە ئەم نامەیەم دەنێرم بۆخانەی پەخش‌و بڵاوکردنەوەکەتان...

ئەم نامەیە هەڵگری پاکترین هەست‌و بیرکردنەوەکانمە، داخوازم لەدوای سپاردنیان بەخاوەن ڕەحمەتی بێ سنوور، بگات بەدەستی ئێوە..

بێگومانم لەوەی پیاهەڵدانەکانی من بۆئێوە لەچاو ئەو خزمەتە بێشوومارەی ئێوەدا زۆر خامۆشە، بەڵام بەتوانای کەمی وشەکانم دەمەوێتبەکورتی دەربیبڕم سەبارەت بە شەخسی مەعنەوی جەنابتان‌و جوانی و پاراوی‌وڕەوانبێژی بەرهەمەکانتان هەرچی بوترێت سەبارەت بەئێوە بەس نییە.

زۆر حەزدەکەم شادببم بەو بەختیارییەی کە ببمە قوتابی ئێوە.

بەڵام بەداخەوە توانای خوێندنی زانكۆم نییە.

بڕیارم داوە لەدوای ئامادەیی بەئیمكانیاتی سنووورداری خۆمەوە كاربكەمو خۆم پێ بگەیەنم، بەڵام سوپاس بۆخودا، پەروەردگارم ئەو كارەی كرد بەنیسبم كەخۆم دەمویست، پیشەی مامۆستایی بوو بەنیسبم.

مامۆستا، زۆرینەی كتێبەكانتانم خوێندوەتەوەتەوە، بەڵام بە پێویستی دەزانم چەند جارێك دووبارە بیانخوێنمەوە.

مامۆستای بەڕێزم...

زۆر حەز بەنووسینی نامەو بەتایبەتیش وەرگرتنی وەڵامی نامەكان دەكەم ئەوە بۆمن سەرقاڵ بوونێكی شیرینە، بێگومان تەكنەلۆژیا چەندیش پێشكەوتوو بێت جێی نامەیەكی دۆستانە ناگرێتەوە كە بەدەستی خۆت نووسیبێتت.چ جای ئەوەی كە ناوەڕۆكی نامەكە باس لە "حەقیقەتەكانی ئیمان" بكات.

مامۆستا لەڕاستیدا من یادگارییەكی وەها بەبایەخم نییە كەبۆتانی باس بكەم یاخود گونجاو بێت تا ببێتە چیرۆكێك بۆ كتێبەكەتان.

لەدڵمدا خاوەنی پەروەردگارێكی میهرەبانم، كە ئاشنای عەشقی خزمەتكردنمە، سوپاس بۆخودا پێشی دەزانم كە دەرفەتی ئەوەی بۆڕەخساندووم، لەئێستادا تاكە ئاواتم ئەوەیە كە بتوانم ئەو دەرفەتانە وەك ئەوەی كەشایەنیانە بەكاریان بهێنم.

هۆکاری ئەم نامەیەم تەنها بۆ ئەوەیە کە ئێوە بزانن منیش هەم و، لەدوعا و پاڕانەوەکانتاندا جێیەك بۆمنێکی تاوانبار بکەنەوە، هەروەها چاوەڕێی ئەوەم کەلەکاتی بەنرخی خۆتانو لەخزمەتی پیرۆزتان کەمێك کات بۆمن تەرخان بکەنو لوتف بکەنو وەڵامێکی نامەکەم بدەنەوە، من چاوەڕوانی ئەوەم لەئێوە هەیە کە بەناوی خزمەتی قورئانەوە، چۆن بتوانم حەقیقەتەکانی ئیمان لەسەر شێوازێکی گونجاو لەگەڵ تێگەیشتنی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە باس بکەم، چونکە من دەمەوێت دەست بەوە بکەم.

تکایە مامۆستا، من لەم بارەدا بەموحتاجی جێ مەهێڵن.

بۆئەوەی بتوانم بەڕوویەکی شایەن بەپیرۆزی خزمەت بەردەوام بم داوای دوعا لەئێوە دەکەم، هەندێك لەگەورەکانم -لەو برایانەی کەزۆر باش لەخزمەت تێگەشتوون- پێیان وتم کە پێویست بەتەواوکردنی زانکۆ ناکاتو پێشیان وتم کە ئاستی زانستیو ئامادەگیم بۆ خزمەتکردن گونجاوە.

بێگومان من هێشتا لەو بارەیەوە خۆم بەئێشککری بەردەم قوتابخانەی زانستیش نازانم و زۆر باش باوەڕم بەوە هەیە کە کەسێکی وەك ئێوە سنگ فراوانو پێگەیشتوو، ئەگەرچی لەزانکۆشدا نەتوانم ببمە قوتابی، دەتوانێت ئەم برا عاجیزەی وەك قوتابیەکی مەعنەوی خۆی قبوڵ بکات.

بۆ تێبینییەشەخصیەکانتان و، ئەو سنگ فراوانیەی کە دەینوێنن و وەڵامــەکانتان کــە بەداواکارییــەکی زۆرەوە چــاوەڕێیان دەکــەم سوپاسگوزاری خۆم عەرز دەکەم.

بەو بۆنەیەشەوە وەکیلی سەلام بە لەخێزانەکـەت کەبەشـانازییەوە وەك خوشکێکی گەورەی مەعنەوی خۆم قبوڵم کردووە.

ڕێزو حورمەتی منیان پێ بگەیەنەو پێیان بڵێ کە زۆر حەزم دەکرد لەنزیکەوە بیان ناسمو چاوەڕێی دوعای خێریان لێ دەکەم.

مامۆستا، دەزانم کە لەکاتی زێڕینی ئێوەم بەزیادەوە کارکرد.

ئێوە بەخودای یەکتاو خاوەن دەسەڵات ئێمـە دەسـپێرمو، لـەخوا دەپاڕێمەوە کە خزمەتـەپیرۆزەکانتان لـە دەماغـە تاریکەکانـدا ببێتـە نوورێکی پرشنگدار.

دەمەوێت زۆر سەلامی دایكو باوکی بەڕێزیشم بەئێوە ڕابگەیەنم.

براتان، بە سۆزدارییەکی بێکۆتـاوە ئارەزوومەنـدی بەندایـەتی ئـەو زاتەیــە کــە بــەردەوامیمان لەســەر بڕیارەکــان پێدەبەخشــێت و، موحتاجی دۆعاکانتان..

خۆشەویستییەکەی ناو دڵم بەخودا دەسپێرمو،

ئێوەش ئەمانەتی ئەو دەکەم.

(ناوەکەی پارێزراوە)



# بائەوەی منی سوتاند،

## ئێوەش نەسوتێنێت

من ئێستا هەڵەی ژیانم دەنووسمەوەو بۆ ئێوەی دەنێرم. ویستم ئەو هەڵەیەی کەمن تێی کەوتم، هیچ کچێکی گەنج تێی نەکەوێت، باکەسێکی تر ئەو ئازارانە نەبینێت چونکە زۆر بەسوێیە.

من لە (بورسیە) لەدایك بوومو هەر لەوێش گەورە بووم، کچەگەورەی خێزانێکی مامناوەندبووم لەئابوریدا.. دووبرای بچوکتر لەخۆیشم هەبوو.

کاتێك دایکم وەفاتی کرد من لەکۆتا قۆناغی ناوەندیدا بوومو براکانیشم هێشتا لەسەرەتایی بوون.

باوكم زۆر خێرا هەڵوێستەی كردو بەتێپەڕبوونی كاتێكی كەم بەسەر مردنی دایكمدا ژنی هێنایەوە.

وەك ئەوەی بە خەیاڵی ئێوەشدا دێت، لەگەڵ باوەژنە تازەكەماندا كەوتینە كێشەوە، باوكم لەژێر هەڕەشەكانی خانمە تازەكەیدا كە دەیوت: "هەموو شتێك بەجێ دەهێڵمو دەڕۆم." ئێمەی پشت گوێ خست، لەبەرئەوە ڕۆژانێكی زۆر سەختمان بەسەردەبرد، من لەبەرئەوەی هەستم بەوە دەكرد، هەموو شتەكانم لەناخی خۆمدا حەشار دەدا. خۆم دەخزاندە گۆشەیەك و بەردەوام فرمێسكم دەڕشتو بەدوای دڵنەواییەكدا دەگەڕام، پەروەردگارم ئەو ئازارانە تووشی هیچ كچێكی گەنج نەكات.

ڕۆژانێكی زۆر سەخت بوون.

لەسەر سووربوونی باوەژنەكەم، باوكم سەرەتا براكانمی دایە (خانەی بێسەرپەرشتان)، بەڵام لەبەر فشاری زۆر وەریگرتنەوەو ناردنی بۆخانەی بێ نەوایان.

من سەبارەت بەو ڕووداوە زۆر دڵخۆش بووم، چونكە براكانم لەلێدان و ئیهانەو برسێتی ڕزگاریان بووبوو، بەڵام من لەبەرئەوەی گەورەتربووم، لەماڵەوەمامەوە. بەردەوام بووم لە قبووڵ كردنی ستەمو ئیهانەو فشارەسەختەكان. تەنها دڵخۆشیو دڵنەواییم،

سەردانی براکانم بوو لەکۆتایی هەفتەداو ئەو کاتژمێرانە بوو کەلەگەڵ ئەوان بەسەرم دەبرد.

مامەم خوالێی ڕازی بێت، لەو ڕۆژانەدا زۆر یارمەتی ئێمەی دا.

خەرجی بەمنیش‌و براکانیشم دەداو هەوڵی دەدا کەپێداویستییە خێراکانمان دەستبەجێ بهێنێتەدی.

لەگەڵ ئەوەشدا باری ئابووری خۆیشی زۆر جێگیر نەبوو خێزانەکەشی ئامۆژنە (سەچیل) بانگی دەکردین بۆماڵەوە، دەیناردینە حەمامو جل‌و بەرگەکانی بۆ دەشۆردین، خوا لەهەردووکیان ڕازی بێت.

سالآنێك بەم شێوەیە پڕ ئازار تێپەڕین.

چیتر ژیانی ئامادەیی‌و هەستەکانی کچێکی گەنج‌و خەیاڵە پەمەییەکان دەستیان پێ دەکرد، ئەو خەیالآنەی کە دونیای منیان داپۆشیبوو..

برادەرەکانی دەوروبەرم زۆر دەمێك بوو، حەشرو نەشریان بە یاری عیشق کردبوو، کوڕێکیش هەبوو کەهەستی خۆشەویستی بۆمن هەبوو، بەلآم من چاوم لەیەکێکی تربڕیبوو.

چاوم لەمامۆستای جوگرافیامان بڕیبوو.

بەڵێ، من عاشقی مامۆستاکەم بووم، لەکاتێکدا ئەو لەبەر ئەو حاڵەی کەمنی تێدا بووم بەنیەتێکی باشەوە بەردەوام لێی دەپرسیم،

ئەمە ئەو شتەبوو کە پێیان دەوت "عەشقی کوێرانە" بێ خواردن و
خواردنەوە بەردەوام بیرم لەوو لەژیان لەگەڵ ئەو دەکردەوە..
زۆر باش دەمزانی کەئەوە کارێکی باش نەبوو دەشمزانی کە بۆ
هەرکەسێکم باس بکردایە، پێکەنینی پێم دەهات بەڵام تۆ وەرەو لەو
دەروونەم تێبگە کە گڕی عەشق گرتبوویەوە ئەمە خۆشەویستییەك
بوو کە بەهەڵە دەستی پێ کردو بەهەڵەش گەشەی کرد.
لەبەرئەوەی مامۆستاکەمان لەنزیك ماڵی ئێمە نیشتەجێ بوو
لەڕێگاو لەمینی بوسدا زوو زوو چاومان بەیەك دەکەوت، لەهەر
بینینێکیشدا گرنگی پێ دەدامو پرسیاری لەکێشەکانم دەکرد، بەڵام
بەهیچ شێوەیەك تێ نەدەگەیشت کەمن بۆی سوتاوم، منیش
نەمدەزانی چۆن تێی بگەیەنم.
ماوەی ساڵێك بەم شێوەیە تێپەڕی..
بۆساڵی دووەم بڕیارم دا بڕۆم بۆلای و هەستەکانی خۆمی بۆ
دەرببڕم، ئەو پێویست بوو بەهەرنرخێك بێت ئاگاداری هەستەکانی من
بێت کەبەرامبەر ئەو هەمە.
وەك چۆن دەڵێن "چاوی عیشق کوێرە" بەڕاستیش وایە،
لەبەرئەوەی نەمدەزانی کە خەریکم چی دەکەمو بەبیرێکی ئارامەوە
پلانم بۆ ئەنجامی ئەم کارەم دانەنابوو، هەستە کوێرەکانم چییان
بوتایە، منیش بۆ ئەولایە دەڕۆیشتم.

بەبڕوای من، ئەو پەیوەندیەی من بۆمامۆستاکەم حەزم پێ دەکرد دوو هۆکاری سەرەکی هەبوو، یەکەمیان: بەزەیی هاتنەوەی بەمنداو هاوکاری کردنم.

دووەمیش: من چیتر بێزار بووم، دەمویست هەرچی زووترە بڕۆمەشوێنێکی ترو ڕزگارم ببێت.

چوونە ژیانی ئەوەوەو ژیان لەگەڵ ئەودا هەم واتای ئەوەبوو کەمن بەکورتە ڕێیەك لەو ئازارانە ڕزگارم دەبوو هەم دەبوومە هاوسەری کەسێکی ڕۆشنبیرو مەدەنی.

بەڵام لەو دیو هەموو ئەو وردەکارییە لۆژیکیانەوە...

ئەوشتەی هەموو بیرکردنەوەی منی وەستاندبوو، هۆگریم بوو بۆمامۆستاکەم.

ڕۆژێك کاتێك دووبارە بە مینی بوس دەڕۆشتین، بەشەوقێکی زۆرەوە ئارەقم دەرکردبوو وتم:

—مامۆستا، دەمەوێت سەبارەت بەباسێکی زۆر گرنگ لەگەڵتاندا قسەبکەم، ئایا دەتوانیت کەمێك لەکاتی خۆتم بدەیتێ.

قبوولی کرد، هەر ئەو ڕۆژە کاتژمێر ١٢:٣٠ لەژووری نەخشە چاوەڕێی دەکردم.

ڕۆیشتم بۆلای..

ئەوە بەشەوقترینو هەڵەترین ساتی ژیانم بوو.

ئێستا بیردەکەمەوە، ئەوە بەڕاستی شێتی بوو!.

دانیشتین، چایەکی خستە بەردەمم‌و دووبارە گرنگی بەکێشەکانم دەدا..

منیش دڵۆپ دڵۆپ ئارەقم لێ دەچۆڕا،، بیرو هۆشم تەنها لای ئەو ڕستەیە بوو.

توانام نەبوو گوێ بیستی هیچ قسەیەکی تر ببم.

ئەو ڕستەیە:

—مامۆستا من تۆم زۆر خۆش دەوێت..

زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

بێگومان منیش تۆم زۆر خۆشدەوێت، تۆکچێکی زۆر وردیلەیت، بەپشتیوانی خودا کێشەکانت چارەسەر دەبن، ئەم ڕۆژانەت وەك یادگارییەکی شیرین دێتەوە یاد.

چاوەکانم داخست‌و کۆتا هەوڵی خۆمدا:

—نەخێر مامۆستا، بەوشێوەیە نییە، من عاشقی ئێوەم ئەوە ساڵێك تێپەڕی‌و من جگەلە ئێوە بیر لەکەسی تر ناکەمەوە.

زۆر بەئارامی و پێکەیشتووانە وەڵامی دامەوە:

—دەتوانم پێشبینی ئەوە بکەم، ئەوە شتێکی سروشتییە، زۆر لەقوتابیەکان هەستیان بەرامبەر مامۆستا نیاز باشەکانیان هەیە، بەڵام ئەمە مەترسی هەیە.

منداڵانە هەڵم دایەوەوتم:

–من ئامادەم بۆ هەموو جۆرە مەترسییەك، بەڵام تکایە وەڵامی نەخێر بەمن مەدەن.

مامۆستاکەم بەردەوام لەژێرەوە دەهاتەوە:

–زۆر باش لە تۆ تێدەگەم، تۆ ڕۆژانێکی سەخت تێدەپەڕێنیتو پێویستت بەکەسێکە ئاگاداریت بکات، گرنگی پێ دانەکەی منیشت بەهەڵە لێك داوەتەوە، من تەنها مامۆستای تۆمو هیچی تر. بەشێوازی تر لێکی مەدەرەوە.

خۆم بێ تاقەت کردو دەستم کرد بەگریان:

–من بەهەموو شتێك ڕازیم، تکایە ڕەتم مەکەرەوە، ئەگینا ناتوانم بژیمو خۆم دەکوژم.

وشەی خۆکوشتن مامۆستاکەمی زۆر ترساند، دەیویست بەجۆرێك ئەو کێشەیە چارەسەر بکاتو باسی لەمەحاڵیی ئەو کارە دەکرد.

دەیوت کە نایەوێت هاوسەرگیری بکات، جیاوازییەکی زۆری تەمەن لەنێوانماندا هەیە، ئەم هاوسەرگیرییە بەباشی ناڕوات، هەروەها دایكو باوکە بەتەمەنەکەی ڕێگە بەمە نادەن بەچەندین هۆکاری تر باسی لەمەحاڵیی ئەو کارە کرد.

جیابووینەوە..

بەڵام من نیازی ئەوەم نەبوو واز لەو کارەم بهێنم چووم بۆ ماڵیان، چاوم بەدایکی کەوتو بابەتەکەم بۆ باس کرد، پێموت کە ئەگەر قبووڵی بکات دەبمە کۆیلەو بەندە بۆی، زۆر پاڕامەوە لێی...

لەکۆتاییدا مامۆستاکەم بەنابەدڵی قایل بوو لەدوای تەواوکردنی ئامادەیی هاوسەرگیریمان کرد.

بەڵێ، ئەو کێشانەی کە بەخەیاڵیشمدا نەدەهاتن لەوەو دوا دەستیان پێ کرد.

ئەو پازدە ساڵ جیاوازی تەمەنەی نێوانمان لەهەرهەڵسوکەوتو هەڵسەنگاندنو داواکارییەکماندا ڕەنگی دەدایەوە.

لەهیچ بابەتێکدا هیچ کات خاڵێکی هاوبەشمان نەدەدۆزییەوە.

دایكو باوکە پیرەکەی لەمنو لەخزمەکانی من ڕازی نەبوون، جیا لەوەش سەردانو گرنگیدان بەبراکانم کێشەکانی ئەوانی زیاتر کردبوو.

بەکورتی ئێمە هاوسەرگیرییەکی زۆر هەڵەمان کرد.

منداڵیشمان نەبوو، ئەو هاوسەرگیرییە تەنها دووساڵی خایاندو بە جیابوونەوە کۆتایی هات.

ئیشێکم بۆ خۆم دۆزییەوەو دەستم بە کارکردن کردو براکانیشم هێنایە لای خۆم. دواتریش دووەم هاوسەرگیریم کردو چوومە دەرەوەی وڵات. دەمەویست ئەوە بڵێم: "سیحری (عیشق) کەم تا زۆر خۆی دەکات بەناو دونیای هەموو کچێکی گەنجدا، هەندێك جار ئەم

عیشقە گوێ لەعەقڵو لۆژیك ناگرێتو، بەردەوام هەڵە بەعاشقەکەی دەکات، بەڵام بانەوە زۆر باش بزانن کە ئەو کەسانەی جیاوازییەکی زۆری تەمەن لەنێوانیاندایە هەیەو لەتەمەنێکی لاویتیدان با هاوسەرگیرییەکی لەو جۆرە نەکەنو، ئاگایان لەخۆیان بێت.

سەرەتا با ئەو شتانە ڕێکبخەن کە گەرەنتی ژیانیان دەکات وەك خوێندنو کار، دواتر بیر لەهاوسەرگیری بکەنەوە.

بابیر لەنزیکی لەمامۆستاکانیان نەکەنەوە، چونکە دوای هاوسەرگیرییەکی لەو شێوەیە کەسێك نەبینراوە کە بەختەوەربێت. هۆکارەکەشی ئەوەیە کەکاتێك قوتابیت وابیر دەکەیتەوە کە ئەو کەسە باشترین کەسی دونیایەو بێ کەموکورتیە، بەڵام دوای هاوسەگیری تووشی نائومێدییەکی گەورە دەبیت، دوای ئەوە کە ڕەسمیات لەنێوانتاندا نامێنێت زۆر شت کە پێشتر نەتان دیوە دێتە پێش چاوتان.

ئەوەش خەم و خەفەتێکی زۆرتان تووش دەکات.

بەهیوای ئەوەم کە هەموو قوتابییەکانتان ئەم ڕستانە بخوێننەوەو ئەمە وەك وەسیەتێك قبووڵ بکەنو هەمان هەڵە دووبارە نەکەنەوە.

لەگەڵ ڕێزمدا...

(ناوەکەی پارێزراوە)

# پێڕست


ئەمە وەسێتنامەی تاوانبارێکە ..................................... ٥
هاوسەرەکەم بەکەم زانی.............................................. ٣٨
لەبەرئەوەی بە بەردەوامی چاو لەدەریووم ژیانم بوویە زیندان........ ٤٦
بمکوژن! من شایستەی ژیان نیم..................................... ٥٥
ئازایەتیش بەو شێوەیە؟!.............................................. ٦٦
بەبێشەرمێك هەڵخەڵەتام و هەموو شتێکم لەدەستدا ................. ٧٤
یادگارییەکی ئاگر ئاسا .............................................. ٨١
منداڵەکەم لە نەخۆشخانە بەجێهێشت و هەڵهاتم ....................... ٩٣
ژیانم گۆڕا .............................................................. ١٠١
پارووی حەڵاڵ........................................................... ١٠٨
تکایە هاوکاریم بکەن................................................... ١١٦
ئێمە قیمەتمان نەزانیوە ............................................... ١٣٤
هەرکەسێك دوعای دایك و باوکی بیگرێتەوە سەرکەوتوو دەبێت ........ ١٣٩
هەرکەس پشت بەخودا ببەستێت دەیباتەوەو ئەوەشی پشت بەبەندەکانی خودا
ببەستێت لەناودەچێت ................................................. ١٤٥
ژوانە پڕ نهێنییەکە.................................................... ١٥١
چۆن دەتوانم ڕزگارمبێت لە ئالودەبوون بە تەماشاکردنی وێنە بێئابڕووەکان١٥٦
بوومە قوربانی هەڵەکانی خۆم........................................ ١٦٢
لەوە دەترسم باوکم بە بێ ئیمانی بڕوات ............................. ١٦٨
لەگەڵ دایك و باوکم ڕێك ناکەوم........................................ ١٧٤
زامی دڵێك................................................................ ١٨١
خۆشەویستی دڵم......................................................... ١٨٧
بانەوەی منی سوتاند، ئێوەش نەسوتێنێت ............................ ١٩١
پێڕست .................................................................. ٢٠٠

İBRET VE GÖZYAŞI

# VASİYET

## HALİT ERTUĞRUL

**ئەم کتێبە دەبێتە وەسیەتێك بۆ هەمووان ..**

کتێبی وەسیەت، ئەو بەرهەمەیە کە چیرۆکی ڕاستەقینەیەو بۆ هەموو خوێنەرەکانمانی پێشنیار دەکەین کە بیخوێننەوە.

وەسیەت، خەیاڵ و حەسرەت و ئازاری هەموو ئەو کەسانەیە کە لەم کۆمەڵگەیەدا دەژین.. وەسیەت، هاوارو ناڵەی "ئێمە کردمان، ئێوە مەیکەن!" و دەنگی یارمەتی ئەو کەسانەیە کە قوربانیی هەڵەکانی خۆیانن، بە تایبەتیش هاواری ئەو گەنجانەیە کە ژیانیان تاریك بووە..

وەسیەت، دوایین ناڵە و دوایین پاڕانەوەی ئەو بێ چارانەیە کە هۆشیان لەدەست داوەو دڵیان تێکچووە. جەرگیان پارچە پارچە بووە. هەروەها لە گێژەڵوکەی بێچارەییدا دەتلێنەوە.. وەسیەت نامە، دوایین داواکاری و دوایین ئارەزووی کەسانێکە کە لەناو بڵێسەی ئاگری گوناهەکانیاندا دەسوتێن.

ئەو نموونانەی کە لە کتێبی وەسیەت دا هەڵبژێردراون ئەوەندە ئاشنان و ئەوەندە باسگەلێکی گرنگن لەناو هەموو خێزانێکدا، کە ناکرێت کەسێك بیانخوێنێتەوەو کاریگەری لەسەری دروست نەکات و نەبێتە وانەو پەند بۆیان.

ئەو هەڵانەی کە لە گەنجێتیدا و بە خەیاڵی شێتانەوە دەکرێن، ئەو گوناهانەی کە ئەنجام دەدرێن و ئەو درامایانەی کە لە بەرامبەردا تووشی خێزانەکانیان دەبێت بە هەموو ڕاستییەکانەوە خراوەتە بەر دیدی خوێنەران.

وەسیەت، وانەیەکی ژیان و نەخشەیەکی ڕێگایە کە پێویستە پێش ئەوەی تووش ببن بیخوێننەوە.. وەسیەت نامە، دەبێتە وەسیەتێك بۆ هەمووان..

کەواتە فەرموون...

ISBN 0-0107-0000-5



نرخی (٣٠٠٠) دینارە

ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

ara.m@hotmail.com

